



ناسنامەی

ناو: بەسەرهاتە کاریگەرەکان بۆ هاوسەران.

نووسینی: حاجی عبدالجلیل.

بابەت : کۆمەڵایەتی.

تیراژ ١٠٠٠ دانە.

چاپ : یەکەم/٢٠١٤.

چاپخانە: ڕۆژهەڵات.




لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٧١٤ )ی ساڵی ( ٢٠١٤ )ی پێدراوە

mdmaktaba@gmail.com

# بەسەرهاتە كاریگەرەكان بۆ هاوسەران

حاجی عبدالجلیل

كۆمەڵە چیرۆك و سەربووردەیەكی خێزانی راستەقینەی پەند ئامێزە ، لەدوورونزیك روویانداوە ، وێرایی هەندێك چارەسەری

یەكەم چاپ/هەولێر

٢٠١٥ز ـ١٤٣٦ ك

بسم الله الرحمن الرحيم

## دەسپێك

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ أَحْسَنَ ٱلْقَصَصِ بِمَآ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ وَإِن كُنتَ مِن قَبْلِهِۦ لَمِنَ ٱلْغَٰفِلِينَ ﴿٣﴾ ﴾ یوسف: ٣ واتە:

**ئێمەچاکترین بەسەرهاتت بۆ دەگێرینەوە ئەی محمد ﷺ بە هۆی ئەم قورئانە کە نیگامان کردبۆلای تۆ لەکاتێکدا تۆلەپێش ئەم قورئانە ئاگادارنەبووی.(لەوانەش وەکوبەسەرهاتی یارانی ئەشکەوت وحەزرەتی یوسف وحەزرەتی مەریەم سەلامی خوایان لێ بێت) ..........هتد**

**سوپاس وستایش بۆخوایی میهرەبان،درووود و سلاّوبۆگیانی پاکی پێشەوامان،بێگومان هەرلەورۆژەی ژیانی مرۆڤ لەسەرئەم زەمینەدەستی پێکردووە،لەگەڵ بوونی مرۆڤەکانیش روداو و بەسەرهاتەکانیش دەستیان پێکردووە لەگەڵ تاڵی وشیرینی ژیان ئاوێتەبوون،ئەگەربەمێژودابچینەوەدەبینین،کەبەسەرهاتەئەوەندە زۆرن لەژمارەنایەن ، جا تێیاندا لە بارونالەبارهەن کەدەکرێ مرۆڤ سوودوپەند و ئامۆژگاریان لێ وەربگرێ بۆژیانی خۆی،ژیر ئەو کەسەیە کەپەند لە خەڵکی وەربگرێت، نەك خۆی بکات بەپەند**

تاپێی لەگەداربێت،جا بەڕاستی ئەم کتێبە(بەسەرهاتەکاریگەرەکان بۆهاوسەران)چەندان بەسەرهاتی تالوشیرینی تێدایە هەر لە کۆنەوە لەسەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ) تاکو ئەمرۆ، لە بەسەرهاتی دوورو نزیك وپەند ئامێز کە ئەگەر هەر کەسێك بیانخوێنێتەوە بەوردی ئەوا زۆر سوودیان لێ وەردەگرێت بۆ ژیانی خۆی وبەتایبەتی لەژیانی(هاوسەرایەتیدا) ،کە بەراستی بۆیان دەبنە مەشخەڵی ڕێی، و ە ڕۆشنکردنەوەی ڕێگای ژیان بۆهەردووجیهان.

کوردستان

هەولێر/ حاجی عبدالجلیل

# ئاهی دایك

گەنجێك دەگێڕێتەوە و دەڵێ:لەو کاتەی کە باوکم مرد هێشتا منداڵ بووم، ناچار بووم بە سەرپەرشتکار و خەمی ماڵ و دایکم کەوتە ئەستۆ،دایکم بەکارەکەری ماڵان کاری دەکرد تا پارویێك نان پەیدا بکات، منیش تاقانە بووم، دایکم بۆم باش بوو، چوومە قوتابخانە و دەستم بە خوێندن کرد تازانکۆشم تەواو کرد،زۆر لەگەڵ دایکم باش بووم ، ناوم لەدەرەوەی وڵات دەرچوو بۆ خوێندن زۆر بەپەرۆشی و چاوی پڕ فرمێسك بەرێ کردم هەردەیگوت:کوڕم ڕۆڵە زۆر ئاگاداری خۆت بە و هەواڵت لێم مەبڕە،نامەم بۆ بنێرە تاکو لە حاڵ و کاروبار و تەندروستیت دڵنیا بم.

دوایی سالآنێکی درێژ خوێندنەکەم تەواو کرد و گەڕامەوە،بەلآم وەکو کەسێکی جیاواز لە پێشتر، و شارسانیەتی ڕۆژئاوا کاری تێکردبووم، و گۆڕا بووم و باوەڕم بێجگە لە شتە مادیەکان بە هیچیدی نەمابوو (پەنا بەخوا).

بە پیشەیەکی بەرزدامەزرام،هەولی دروست کردنی خێزانم دا،دایکیشم ئافرەتێکی زۆر جوان و دیندارو دەولەمەندی بۆ

دۆزیمەوە،بەلاَم من ڕەتم کردەوە،چونکە دینداریم بە کۆنە پەرستی دەزانی، خەونم بە دوارۆژی مۆدێرن دەبینی!!
پاش شەش ژیانی هاوسەریم پێکهێنا،هاوسەرەکەم هەر لە سەرەتاوە زۆر ڕکی لە دایکم دەبوەوە،ڕۆژێك لە ڕۆژان کە چوومە ماڵەوە دیتم هاوسەرەکەم دەگریا،لێم پرسی بۆچی دەگری؟
هاوسەرەکەم گوتی:بزانە یان من هەڵبژێرە یان دایکت من ناتوانم لەم ماڵەدا لەگەڵ دایکت دا بژیم....
شێت و هار بووم یەکسەر دایکم دەرکرد،دایکم بەگریان دەرچووڕۆیشت ،بەلاَم هەر دەیگوت کورەکەم خوا بەختەوەرت بکات.
سەرنج بدەن لە دڵی دایك چەندە گەورە و پڕ سۆزە ڕۆڵە تاقانەکەی دەریدەکات بەلاَم ئەو هەر داوایی کامەرانی و بەختەوەری بۆ دەکات ئای لەدلی دایك !!!!
کوڕەکە دەڵێت پاش چەند سەعاتێك پەشیمان بوومەوە و بەدوایی دایکم دا چووم،بەلاَم نەمدۆزیەوە و گەڕامەوە بۆ ماڵەوە هاوسەرەکەم بە فێڵ و تەڵەکەبازی لە بیری بردمەوە...

پاش ماوەیەك توشی دەردێكی پیس هاتم،دایکم بەوەی زانیبوو،هاتبووە نەخۆشخانە بەدوامدا بەڵام من ئاگادار نەبووم،هاوسەرەكەم پێی گووتبوو:

كوڕەكەت لێرە نییە چیت لێمان دەوێ نە هیچی ئێمەو نە هیچی تۆ برۆ...

دوایی ماوەیەكی درێژ لە نەخۆشخانە دەرچووم،پیشەكەم لە دەست چوو بوو ،زۆر قەرزار بوومەوە، بە هۆی دەستبلاٚوی‌وستەمی من‌وهاوسەرەكەم، هاوسەرەكەم كە منی بینی پەڕپوت مامەوە:گوتی بەخوا من پێت ڕازی نیم من ناتوانم لە گەڵ تۆ بژیم بە پەرپوتی و قەرزداری تۆ نەدار و هەژاری و بێ كارو پیشە لەناو خەڵكی قێزەونی،بەڕاشكاوی دەمەوێ تەلاٚقم بدەی من ناتوانم لەگەل تۆدا ژیان بەسەر ببەم...

ئەو قسانە وەكو هەورە تریشقەیەك بوون بەسەرم داكەوت،بۆیە تەلاٚقم دا،كەمێك مێشكم هاتەوە سەرو دایكم هاتەوە بیر كە بچم بیگەڕێنمەوە لای خۆم و دەستم كرد بەگەڕان بە دوایدا،لە دواجاردا دۆزیمەوە، بەلاٚم چ دۆزینەوەیەك لە خانەی بێنەوایان دۆزیمەوە،كە چوومە لای دیتم كاریگەری فرمێسك و گریان لە ڕوخساری دیاربوو،كەوتمە سەرپێیەكانی و دەستم كرد بە ماچ

کردنی هەتا زۆر گریام ئەویش لە گەڵ من زۆر گریا،سەعاتێکمان پێ چوو، ئەوجا بڕیارم دا بەڵێنم پێ دا کەوا بۆ هەمیشە خزمەتی بکەم و لە فەرمانەکانی خوداش دەرنەچم ئیدی.

بەڵێ بەڕاستی بێڕێزی و ئازار دانی دایك و باوك بەڕاستی ستەمێکی یەکجار زۆر گەورەیە (بەتایبەتی دایك)هەروەکو ئەم کوڕەمان بینی کە لە ئەنجامی بێ وەفایی چی بەسەر هات و هەموو بەختەوەریەکی ژیانی لە دەست چوو، پەرپوت مایەوە،چونکە ئەگەر هەموو تاوانێك خودا بۆ قیامەت دوای بخات بەڵام تاوانی بەرانبەر دایك و باوکان خودا لە دونیاش تۆڵەی لێ دەکاتەوە و هەروەها بەهەشتی ڕازاوەی خوداش لەو جیهان لە دەست دەچێ،جا بەڕاستی ئەوە بەزەیی خودا بوو کەوا ئەو کوڕە لە کۆتایدا هاتەوە سەر خۆی ڕێگایی ڕاستی دۆزیەوە،ئەگەرنا دەبا هەموو ژیانی هەروا لە بەدبەختی و چارەڕەشیدا بەسەربرد بایەو سەرو هەردوو جیهانی بدۆڕاندبایە.

خوایی گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ وَهْنًا عَلَىٰ وَهْنٍ وَفِصَٰلُهُۥ فِى عَامَيْنِ أَنِ ٱشْكُرْ لِى وَلِوَٰلِدَيْكَ إِلَىَّ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ ﴾ لقمان: ١٤

واتە:فەرمانمان داوە کە ئادەمیزاد بەچاکە ڕەفتار لەگەڵ دایك و باوکی بکات، دایك نۆ مانگ لەسکی بە ئازارەوە هەڵیگرتووی، دوایی دوو ساڵ لە شیر بڕینەوەی ئەی مرۆڤ سوپاس گوزاری من و باوانت بکە و گەڕانەوەش بۆ لای ئێمەیە.

هەروەها جارێکیان کابرایەك هاتە خزمەتی پیغەمبەر(ص)گوتی: ئەی پێغەمبەر خو ا(ﷺ) کێ لە هەموو کەس شایەنترە کە بەخێوی بکەم و خزمەتی بکەم؟

فەرمووی:دایکت.

گوتی:دوایی کێ؟

فەرمووی:دایکت.

گوتی:دوایی کێ؟

فەرمووی:دایکت.

گوتی:دوایی کێ؟

فەرمووی:ئەوجا باوکت.

ئەم فەرموودەیە بوخاری و موسلم گێڕاویانەتەوە

# دایە

خۆشەویستەکەم دایەی شیرینم
هەوێنی ئەوین ومایەی ژینم
لە دووریت پەست وچاو بەگرینم

ئەی پەرۆشترین کەس لەم دنیایە
بەنرخترین سەرمایە دایە
خۆشەویستیت قەت کۆتایی نایە

نازانم لە سۆزت چی دەربڕم
بەرانبەر یادگاریت واقی وڕم
بە ئەشك چی بنوسم خامە شڕم

لەو ڕۆژەی بارگەت تێك نا بەرەو دووڕ
منت بەجێ هێشت لەو پەڕی ناسۆر
ئیدی چۆن چاو بە ئەشك نەبم زۆر

دایــــــه خــۆشەویستی ئەی پەروەردکارم
مـــــــن لە ســۆزت گەلیـــێك شەرمەزارم
هەرچیـــــت بۆ بکـــەم هــەر قـــــــەرزارم

بـــــەلێن بـــــێ تامـــــابم لـــــە ژیـــــان
وەفـــــــادارت بم بـــــــه دڵ وگیـــــــان
چـاکەم هــەمووی پێشکەشــت بــێ قوربـان

دایـــــه پەیمان بێ لە بیرت نەکەم
لە نوێژەکـانم نـزات بۆ بکەم
تەمەنم فیدات بێ دڵسۆزەکەم

دایه هه چی بۆت بکەم هەر کەمە
چونکه ژیـان بێ تـۆ ئەســــــتەمە
ئیدی تادیدارت گـڵـکۆت رێگـــــەمە

٢٠٠٨/٢/٢

# بێوەژن

پیاوێکی کاسب پاش ئەوەی بەرەنجی شانی خۆی پارەیەکی کۆکـــــــــردەوە ، ویستی خانوێك بکڕێ تامندالەکانی تێیدا بحەسێنەوە،بۆیە چووە لای نوسینگەیەکی کڕینی خانوو بەرە، گوتی:دەمەوێ خانوێکم بۆ بدۆزنەوە.

خاوەن نوسینگەگەش گوتی:سبەی وەرەوە لە فلآن گەڕەك خانوێکمان بەو پێناسەیە هەیە بۆ فرۆشتنە.

کڕیارەکەبۆ سبەی چووەوە لای دەلالەکە، پێی گوت:بابچین تە ما شایی خانوەکە بکەین.

پێکەوە بەرەو خانووەکە چوون لە دەرگایان دا چوونە ناو خانووەکە...

کەسەکریارەکە بۆ سەیری خانووەکە چاوی بەو لاو بەولادەگێرا، لەو کاتەدا ژنێك و کۆمەڵە منداڵێکی وردی بەرچاو کەوت کە لە گۆشەیەکی ماڵەکەدا دانیشتبوون و دەگریان.

ژنەکە دەنوزایەوە و دەیگوت:خوا ئەو کەسە بگرێ کە دەیەوێ لەو خانووە دەرمان بکات و ئاوارەمان بکات،لەو کاتەدا کریارەکەگوێ ی لە نوزەی ئەو ژنە و دیمەنی منداڵەکان بوو،کزەی لە جەرگیوە هات

یەکسەر لە ماڵەکە دەرچوو، دەلاڵەکەش بەدوایدا ڕایدەکرد و هەر دەیگوت:خانوەکە باشە؟ هابەدڵتە؟...

کڕیارەکە گوتی:جارێ تۆ لە من گەڕێ، باسی ئەو ژن و منداڵانەم بۆ بکە چیانە؟

دەلاڵەکە گوتی:بەسەرهاتی ئەو ژن و منداڵانە ئەوەیە کەوا باوکەکەیان خاوەنی ئەو خانووە بوو مردووە،خانوەکەش بەناوی ئەوە،ئێستاش کەس و کارەکەی دەیانەوێ ئەو خانووە بفرۆشن و وەکو میرات پارەکەی بە سەر خۆیان دابەش بکەن ، ئەم هەتیوانە کە بێکەسن نازانن سەر بەکوێ دا بکەن ئاوارە و پەرگەندە دەبن،بۆیە دەگرین و دەنوزێنەوە.کڕیارەکەش گوتی:ئەم خانووە من ڕازیم بیکڕم و پارەکەی چەندە؟ سبەی دەیهێنم، لەسەر کڕینی خانوەکە ڕێك کەوتن،بۆ سبەی پارەکەی بردودایی بەدەلالەکە و پێکەوە چوونەوە ماڵەکە لەو کاتەدا دیتی خەم و ترسی ئەو کۆس کەوتانە زیاتر بووە و زۆر بە کوڵ دەگرین.

کڕیارەکەش ڕووی کردە دایکەکە و گوتی:خوشکێ هیچ خەفەت مە خۆن و مەگرین من ئەو خانووەم کڕیوە ،هەتا هەتایە لە ناوی بمێنەوە و پاشان بڕۆ بەشە میراتەکەی خۆشت وەربگرە ،ئەوەش تاپۆی خانوەکەیە بەناوی تۆم کردوە.

لەو کاتەی ئەو ژن و مندالآنە ئەو هەواڵەیان بیست گەشانەوەو خەریك بوو لە خۆشیان بفڕن ،دەستیان بەدوعا و سوپاس گوزاری کرد لەسەر پیاوەتیوبەخشندەییوخێرخوازی ئەوکەلە پیاوە بەخشندەیە.

پیاوەکەڕۆیشت و لە جیاتی ئەوەی خانوەکە بۆ خانەوادەکەی خۆی بکڕیوتێدا بحەسێنەوە،بەلکولە پێناوی خوا بەخشیە ئەو خێزانە بێنەوایە بێناز و هەژارە،بەڵێ بەڕاستی ئەومیە سەروەری و پیاوەتی،(کاك سالم) کەئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە دەڵێ پاش ئەوەی ئەو خێرە گەورەم کرد نازانم چۆن خوای گەورە دەرگایی خێر و بەرکەتی بەسەردا کردمەوە دەستم بۆ هەر شتێك دەبرد بۆم دەبووە زێڕ و خێر و بەرەکەت ، هەتا وایی لێ هات زۆر دەوڵەمەند بووم ماڵ و منداڵەکان کەوتنە ناو ناز و نیعمە تەکانی خودابەڵێ ئەمەیە ئەنجامی بەخشندەیی ودەستکراوەیی و خێرخوازی هەروەکو پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموویێت:

(یا اِبْن ادَم اَنفِق یُنْفِق عَلَیْك).

واتە : ئەی ئەوەی ئادەم ببەخشە خوایی گەورە پێت دەبەخشێت و ناز و نیعمەتی خۆی بەسەرتدا دەڕێژێ ، بەڵێ پاش ئەوەی ئەو خێرخوازە کۆچی دویی کرد هێشتا هەر منداڵەکانی لە خێر و بەرکەتدا دەژین ، بێگومان ئەو خێرخوازەش کاتێك لەڕۆژی

قیامەتدا كەس بەكەڵكی كەس نایەت خوایی گەورە بەبەهەشتی خۆی شادی دەكات و دەیكاتە یاوەری پێغەمبەری خۆشەویست بەدەقی ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەر(ﷺ)كە دەفەرموێت:
(انا وَ كافِلُ اليَتيمِ كَهاتَيْن في الجَنّة).
واتە:من و سەرپەرشكاری هەتیو وەكو ئەم دووپەنجەیەین پێكەوە لە بەهەشتدا،ئاماژەی بۆ پەنجەی گەورە و پەنجەی شەهادە كرد خوا بەقسمەتی ئێمەشی بكات ئامین.

# ڕۆژان ڕۆژێ له دوایه

پیاوێك هەبوو زۆر دەوڵەمەند بوو،خودا بەسەری داباراندبوو، له هیچی کەم نەبوو،له ناز و نیعمەتی خوادا دەژیا،ژنێکی زۆر چاك و پاك و خێرخواز و بەرچاو تێری هەبوو ، بەلاّم کابرا زۆر چاو چنۆك‌وخێرنەخوازبوو،ژنەکەی زۆر هەوڵی دەدا کەوا فێری چاکەی بکات و ڕەوشتی بگۆڕێت ، بەلاّم ئەم زۆر سەرسەخت و له خۆ بایی له خوا نەترس بوو.

ڕۆژێك لەڕۆژان پێکەوە لەسەر خواردنێکی خۆش و چەور دانیشتبوون لەو کاتەدا هەژارێکی برسی لەدەرگایی دا،خاوەن مالەکەش چووە دەرەوە گوتی ها چیت دەوێ؟

کەسە هەژارەکەش گوتی:زۆر برسیمەو پارویێك خواردنم دەوێ زگە برسیەکەم پێ هێمن بکەمەوە کاتێك خاوەن ماڵەکە گوێی لەو قسانە بوو چاوی چووە پشتی سەری و سور هەلگەڕا و زۆر بەتوڕەی و جوێندان و نەفرەت کردن وەلاّمی هەژارەکەی دایەوە و دەرگایی بەڕو داخست و دەری کرد.گوتی : من بکەم تۆش بخۆی؟

ژنەکە گوتی:ها پیاوەکە خێرە چی بووە؟

پیاوەکەگوتی:هیچ و پوچێك هاتۆتە بەر دەرگاو داوایی خواردن دەکات، دەزانی من زۆر رکم لەو جۆرە کەسانە دەبێتەوە!

ژنەکەش گوتی:ئەگەر پاروێکت دابایە چی دەبوو؟

پیاوەکە گوتی:پاروی چی؟من بەئارەقەی نێوچەوانی خۆم پەیدای بکەم و بیدەمە خەڵکی؟

ژنەکە گوتی:خوایی گەورە زۆری پێ بەخشیوین سوپاس بۆ خوا.

پیاوەکەگوتی:ئەگەر ئەو قسانە بکەی نەهیچی من و نەهیچی تۆ.

ژنەکە:پیاوەکە پاش ئەو هەموو ژیانە پێکەوەمان بەسەربردنەوها ڕەفتارم لە گەڵدا دەکەی و هەڕەشەم لێ دەکەیت؟

لەدوای مشتومڕێکی زۆرپیاوەکە وتی: بڕۆ تۆم تەلاق دا...

ژنەکە ڕۆیشت و لێك جودا بونەوە ڕۆژگار هات و ڕۆژگار ڕۆیشت ئەو ژنە ستەم لێ کراوە، قەدەری خوا شوی بەپیاوێکی زۆر بەخشندە و میهرەبان کردەوە لە پاداشتی ئەو ستەمەی کە لێی کرابوو ئەو پیاوەی هەبوون و خێرخواز بووبەلام میردەکەی پێشتری هیچی نەماو پەرپوت بوو ،بووە سوالکەر، ڕۆژێك ئەو ژن و مێردە لەسەر سفرەی نان خواردن زۆر بەخۆشی و ئاسودەیی دانیشتبوون نانیان دەخوارد ،لەو کاتە لە دەرگا درا.

ژنەکە گوتی کێیە؟

وەڵام درایەوە:هەژارێکم وا لە برسان دەمرم ڕەحمم پێ بکەن ، مێردەکەی گوتی:بڕۆ ئەو مریشکە سوور کراوەیەیی بدەرێ.ژنەکە چوو مریشکەکی دایە و بە گریان هاتەوە، پیاوەکەی لێ پرسی:بۆچی دەگری؟

ژنەکە بەســـەرهاتی خۆی بۆی گێڕایەوە و گوتی:ڕۆژێکی ئەوها مێردەکەم هەژارێکی برسی شاپ داو هیچی نەدایە و دەری کرد و هەر لەسەر ئەو هەژارە منی تەلاّق داو بەرێ ی کردم....... ئەو هەژارەی بەردەرگامێردی من بوو.

پیاوەکەش گوتی:ئەوجا سەرت لەچی سوڕماوە ئەو هەژارەش من بووم .....!!!

بەڵێ بەم جۆرە ئەو ژن و مێردە زۆر بەشادومانیو دڵ فراوانی و دەست کراوەی دەژیان ئاوڕیان لە هەژاران و نەداران دەدایەوە و کەسیان بێ ئومێد بەڕێ نەدەکرد، خواش هەر زیاتریانی پێ دەبەخشی و لەناو ناز و نیعمەتی خوادا دەژیان پیاوەکەی یەکەمیش بە چاو چنۆك و چروکی هەموو نیعمەتێکی لە دەست چوو لەپ و لەپ کەوت و کەوتە ناو دەردەسەریوناخۆشیو چەرمەسەری، هاتەوەسەرساجی عەلی چونکە دڵی ڕەحمی تێدا نەبوو.

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ لايرحَم النّاسَ لايَرحَمْهُ اللّة)
واتە هەرکەس رەحم بەخەڵکی نەکات خواش رەحمی پێ ناکات
هەروەهافەرموویەتی: هیچ بەیانیەك نیە مەگەر دوو فریشتە لە
ئاسمان دانەبەزن و یەکێکیان داوا دەکات:خوایە بەو کەسە ببەخشە
کە دەیبەخشێت،وە ئەوی تر دەفەرمویت:خوایە گیان لەوکەسە
بگرەوە کە نابەخشێت و چرۆکە. (ئامیـــــــن)
هەروەها خوایی گەورە فەرموویەتی:
(هەرچی خێرێك ببەخشن بۆ خۆتانە،بۆ ڕزامەندی خوا بێ و ئەوە
ئەو چاکەیە دێتەوە ڕێگاتان و هەرگیز ئێوە ستەمتان لێ ناکرێ).
بۆیە دەڵێن:
هەر کەسێك خێر و چاکە بچێنێ.
بۆ دوور و نزیك پێش خۆی دەبینێ.
برا با هەمیشە چاکە مەبەستت بێ.
بۆ خوا با بەخشین دیاری دەستت بێ.
هەرچەند چیا قەت بە چیا ناکەوێ.
بەڵام ڕۆژێك دێ چاو بە چاو بکەوێ.
نە خەتایی منە و نە سوچی تۆیە.
ڕەزیل دوا ڕۆژی هەر ڕەنجە ڕۆیە.

# عیشق

پێشەوا قورتبی دەگێڕێتەوە: گەنجێکی بانگدەر لە میسر هەبووسالآنێکی درێژ بەو کارە خەریك بوو،بەچاکە و خواناس ناسرابوو،نور لە ڕوخساری دەدرەوشایەوە ، هەموو ڕۆژێك دەچووە سەر منارەی مزگەوتەکەو بانگی دەدا،رۆژێك لە بن منارەی مزگەوت چاوی بەکچێکی زۆر جوانی دیان (مسیحی)دەکەوێ، گیرۆدەی داوی عەشقی شەیتانی بوو،لە منارەکە دابەزی و روویکردە ماڵی کچەکە و لە دەرگایی داو کچەکە هاتە دەرەوە:

پێی گوت:چیت دەوێ؟

گوتی:تۆم خۆشدەوێ؟

کچەکە گوتی:بۆچی؟

گەنجەکەگوتی:شێتوشەیدات بوومە،ئارمم لێبراوە و دڵمت بردووە.

کچەکە گوتی:گومانم لێت هەیە ناتوانم وەڵامت بدەمەوە!

گەنجەکە گوتی:دەتخوازم!!

کچەکە گوتی:تۆ موسڵمانی من مەسیحیم باوکم من بەتۆ نادات.

پێی گوت:دەبمە دیان.

کچەکە گوتی:ئەگەر دەبی زۆرباشە.

گەنجەکەبووە مەسیحیوخواستیومارەی کرد و لە هەمان خانوودا پێکەوە بوون ، پێش گواستنەوەی ڕۆژێك بە قادرمەی دار دەچێتە سەر بانەکەی بۆ کارێکی پێویست و یەکسەر بەر دەبێتە خوارەوە و دەکەوێ و دەمرێ!! خۆی دۆڕاند و بەگاوری سەری نایەوە.

جا بەڕاستی ئەگەر مرۆڤ لە خوا نەترسا و چاوی هەروا بەڕەڵا کرد، وەکو گورگی هار هەمیشە چاوەکانی گێڕاو لە خوانەترساو چاوی لە حەڕام نەگرتەوە ئەوە لەوانەیە ڕۆژێك لە ڕۆژان هەر توشی بەزم و ڕۆژە ڕەشی خۆی ببێت وحەیای بچێ،چونکە زۆر جار ئەگەر مرۆڤ لە فەرمانی خوا دەرچوو و بێ شەرمی کرد ئەوە خوایی گەورەش شەیتانی بەسەردا زاڵ دەکات و دەیکاتە کۆیلەی ئارەزووەکانی.

لەبەر ئەوە چەندان جار وابووە کەوا مرۆڤی دیندار و پابەند لە ئەنجامی تەماشا و چاو گێڕانی توشی لادان و گومڕایی و ستەم بووە،هەروەها چەندان جار وابووە کەوا مرۆڤێکی ڕۆشنبیر بۆتە دیلی ئارەزووەکانی وەکو گورگێکی هاری لێ هاتووە ، لەبەر ئەوە تکایە تخوا بائاگاداری چاوەکانمان بین و بیان پارێزین و لە حەڕام دووریان بخەینەوە نەوەك بەدەردی دلان بچین بەتایبەتی لەم ڕۆژگارەدا کەوا هۆکارەکانی ڕاگەیاندن و پێکگەیشتن ئاسان بوونە و

ئاژاوه و پیلان له هەر هەمووان نزیکتره له شادەماری ململانێ(پەنا بەخوا)

هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ)فەرموویەتی:

(النَّظَرُ سَهْمٌ مَسْموم مِنْ سِهامِ اِبْلِيسْ فَاجْتَنِبة)

واته:تەماشایی حەڕام تیرێکی ژەهراویە له تیرەکانی ئیبلیسی شەیتان خۆتانی لێ بپارێزن،

## سزای ڕەزیلی

(سەفیەی کچی شیبه)دەڵێ: ڕۆژێك له خزمەتی عائیشەی خێزانی پێغەمبەر(ﷺ) دانیشتبووین، ژنێك هات دەستی بەسترا بۆوه به پارچه پەڕۆیەك ،گوتی له بەرئازاری دەستم هاتووم، ژنەکه گێرایەوه گوتی باوکم کابرایەکی زۆر بەخشنده بوو،له خەو دا دیتم لەسەرچەند حەوزێك لەگەل کۆمەڵێك پیاو بوون و جامی ئاویان به دەستەوه بوو، ئاویان دەدایه خەڵکی و باوکیشم لەوێ بوو لێم پرسی ئەی کوا دایکم؟حاڵی چۆنه؟

باوکم گوتی:دایکت خێرخواز نەبوو قەت خێری نەدەکرد،یەکجار زۆر ڕەزیل بوو،له ژیانی پارچه پەڕۆیەك و پارچه بەزێکی کردبووه خێر،جا ئەو بەزه شل دەبێتەوه و گەروی پێتەڕ دەکاتەوه

دایکمم بینی ڕووت و قوتەو تەنها ئەو پارچە پەڕۆیەی هەیە کە کردبویە خێر، هەر هاواردەکاتو دەلێ وایی تێنوم بۆ ئاو،جا ژنەکەش گوتی منیش جامێك ئاوم وەرگرت و دامە دایکم، دەنگێك لە سەرەوە هات و گوتی:کێ ئاوی دایەئەوژنە خوا دەستی وشك بکات،ئەوجا دەستم ئەوهایی بەسەر هات کەوا دەیبینن، وا وشك و لەکارکەوتوە. بەلێ خێر و چاکە و بەخشین بە هاناوە چوونی هەژاران و نەداران و بێ نەوایان و هەتیوان لە نیشانەی بڕواداریيە و دروشمی پیاوەتی و دلنەرمی و بەزەیی پێ هاتنەوەیە، کەسی خێرخواز بە بەخشینەکەی لە دنیاو دوواڕۆژدایە لە سێبەری دەحەسێتەوە و خوا بەختەوەری دەکات، هەرگیز ماڵ و سامان بە بەخشین کەم نابێتەوە،بەلکو ئەوە هەمووی تیختیخەی شەیتانە، کە پێمان دەلێ مەبەخشە،ماڵ و سامانەکەت کەم دەبێتەوە و لەدەست دەچێ و نەکەی بیبەخشی بۆ خۆت هەلێگرە...لە ئەنجامیشدا سەر ئەنجامەکەی هەروەکو ئەو ژنەی بەسەر دێ کە ڕووت و قوتی و توێنیەتی بوو،کە لە خوا داواکارین بەخشندەو دڵ فراوانمان بکات،لە ڕەزیلی و چاوچنۆکی پەنامان بدات،هەرخۆشی بەخشندەو لێ بوردەیە. خوای گەورە لە سزاو چارەنوسی ئەو

جۆرانە دەفەرموویت: ﴿ وَأَمَّا مَنۢ بَخِلَ وَٱسْتَغْنَىٰ ﴿٨﴾ وَكَذَّبَ بِٱلْحُسْنَىٰ ﴿٩﴾ فَسَنُيَسِّرُهُۥ لِلْعُسْرَىٰ ﴿١٠﴾ وَمَا يُغْنِى عَنْهُ مَالُهُۥٓ إِذَا تَرَدَّىٰٓ ﴿١١﴾ ﴾ الليل: ٨ - ١١

واتە:هەر کەسێك ڕەزیل و دەست قونجاو خۆی بێ نیاز دەکا و، بڕوایی بە بەخشین نەبێ بە درۆی بخاتەوە ئەوە ئێمە ڕێگایی چەرمەسەری بۆ ئاسان دەکەین سەر ئەنجام فڕێ ی دە دەینە ناو دۆزەخ. هەروەها خۆشەویست (ﷺ)دەفەرموویت: (دوو سیفەتی ڕەزیلی و بەدڕەوشتی لە دڵی ئیماندارێك کۆنابنەوە)

## چ بچێنی ئەوە دەدووریەوە

پیاوێك هەبوو زۆر لەگەڵ ژنەکەی خراپ بوو،هەمیشە لەگەڵی لە شەڕو هەرا دابوو،ژنەکە زۆر بەدەستیەوە بە ئازار بوو،ڕۆژێك هەم دیسان شەڕو ناخۆشی کەوتەوە نێوانیان،مێردەکەش لە توڕەیی و بۆ تەمبێ کردنی دارێکی گەورەی بە دەستەوە گرت و بەسەری ژنەکەی داکێشا،ژنە بەستەزمانەکەش یەکسەر کەوتە سەر زەوی و گیانی لە دەست دا،لە بەر زەبری دارەکە، مێردەکەش کە بینی ژنەکەی مرد زۆر ترسا و شڵەژا زۆر بیری هێناو بردو نەیدەزانی چی بکات چۆن خۆی لەم گێژاوە ئاڵۆزە دەرباز بکات،زۆر بیری

کردەوە هیچ ڕێگایەکی نەدۆزیەوە، بۆیە یەکسەر ڕۆیشت بۆ لای دۆستێکی نزیکی کارەساتەکەی بۆی گێڕایەوە کەچی بکات و چۆن خۆی لە کەسوکاری ژنەکە و یاسا و پۆلیس ڕزگار بکات؟!.
برادەرەکەی پێی گوت:زۆر ئاسانە برۆ لەبەر دەرگا ڕاوەستە هەتا گەنجێك بەوێدا ڕەت دەبێ و بەهەر فێڵێك بێ بیبە ژورەوە دەرگایی لەسەر دابخە ولەژوورە وە بیکوژە و لە تەنیشت تەرمی ژنەکەت درێژی بکە ، بڵێ ئەو دوانە زینایان کردوە بۆیە کوشتومن بەوەش لە هەموو سزایەك ڕزگارت دەبێ.
پیاوی بکوژیش گوتی:بەڕاستی تەکبیرێکی چاکە هەناسەیەکی قوڵی داو بەرەو ماڵەوە یەکسەر گەڕایەوە،چاوەڕوانی کرد لەو کاتەدا گەنجێکی ڕێك و پێك و قۆز بەوێ تێپەڕی، یەکسەر بانگی کرد و داوایی لێ کرد کە لەگەڵی بچێتە ژوورەوە،گەنجەکە زۆر سەری سوڕما لەو داوایە حەپەسا لەو پێشوازیە گەرمەیی!!ناچار چووە ژوورەوە پیاوەکەش دەرگای لەسەر داخست و تاوانە قێزەونەکەی ئەنجام داو گەنجەکەی کوشت و لە تەنیشت تەرمی ژنەکەی درێژی کرد،ئەوجا هەواڵی دا دۆستەکەی و دەست خۆشی لێ کرد و لەگەڵی دا هات بۆ ئەوەی سەیری ڕوداوەکە بکات،کە هاتە ژوورەوە ڕوداوەکەی بینی یەکسەر کەوتە سەر زەوی و لە هۆش خۆی

چووتو مەزانە ئەو گەنجەی کە کوشتبووی کوڕی ئەو کەسە دەرچوو کە تەکبیرەکەی بۆی کرد بوو!!بەڵێ چ بچینی ئەوە دەدوریەوە بەڕاستی پەندێکی بەپێز و بە هێزە.

بەڵێ ئەو دۆستەی لە جیاتی ڕادەستی دادگایی بکات و هەواڵەکەکە بگەێنێتە لایەنی بەرپرس، قوری بەسەری خۆی کرد،جەرگی خۆشی بڕی و ماڵی خۆشی کاول کرد،ڕێگایی تاوانی گەورەتری نیشان داو بووە هاوبەشی ئەو تاوانە گەورەی ئەو تاوانبارە بکوژە و هەردوو جیهانیشی دۆڕاند، بووە ڕیسوایی بەردەرگای خوداو ڕۆژی قیامەتیش وگەورەترین سزایی دەدرێت.

هەوەکو خودای گەورەش لە قورئاندا دەفەرموێت:

﴿ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ ۚ وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ يُدْخِلْهُ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا ۚ وَذَٰلِكَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ ﴿١٣﴾ ﴾ النساء :١٣ واتە: هەرکەسێك ئیمانداریێك بەمەبەست بکوژێ ئەوە سزایی دۆزەخەو بۆ هەمیشەی تێیدا دەمینێتەوە و نامرێ،هەروەها خوا لێی تورەیە و نەفرەتی لێ دەکات و سزایی پڕ ئێشی بۆی ئامادە کردووە(پەنا بەخوا).هەروەها دەربارەی کوشتنەوەی گەنجێك(عبدالله کوری عومەر)(رضي الله عنه) دەڵێ:

گوتم:کوشتنەوەی فێڵە،عومەریش فەرمووی ئەگەر هەموو خەڵکی (سەنعا)بەشداری لەکوشتنێ کەسیك بکەن هەر هەموویان دەکوژمەوە،
هەزاران رەحمەت لە گیانی عومەری دادپەروەر بێت.

## هاواری ویژدان

پیاوێك هەبوو دووژنی هەبوو، ژنی یەکەمی کوڕێکی هەبوو ، بەڵام ژنی دووەمی هێشتا هیچ منداڵی نەببوو، بۆیە زۆر ئیرەیی بەژنی یەکەم دەبرد،چاوی پێ هەڵنەدەهات،خۆزگەی دەخواست منداڵە ساوایەکە ی شتێکی بەسەر بێت لەکۆڵی بێتەوە ،ڕۆژێك ئەو منداڵە ساوایە کەدایکی لەوێ نەبوو، بەتەمایی زڕدایکی لەمال جێ هێلرابوو ، تەنها باوەژنی لەوێ بوو ئەمانەتی ئەو درابوو ،دیتی گۆلکێك لەوێ پەیدا بوو دەمی برد بۆ قۆنداغی منداڵەکە ژنەکە هیچ خۆی تێك نەدا و زیرەی ئەو منداڵە دەچووە تاقی ئاسمان، بەلام ئەو ژنە هیچ خۆی تێك نەدا،هەتا گۆلکەکە پەنجەکانی کرۆشت و پەنجەکانی لێ کردەوە.

ڕۆژگار هاتن و تێ پەڕی کوڕەکە گەورەبو دایکی ئەو منداڵە مرد و لەگەل زڕدایکی مایەوە ، زۆری نەبرد باوکیشی کۆچی دوایی کرد ،ژنەکەش لەو ماوەیەدا سێ منداڵی بوو،مناڵە پەنجە بڕاو و خوراوەکەش کەوتە ژێر زەبری ئەو زڕداکە بێ بەزەییە و منداڵەکانی پاشان بەرەبەرە گەورە بوو ئەو ژنە کەسی نەبوو،کەوا نانێکی بۆ پەیدابکات بێجگە لەو کوڕە،ئەو کوڕەش زۆر مەردانە قۆڵی کاسبی لێ هەڵمانی بەدەستە گۆجەکەی کاسبی دەکرد و زڕدایکەکە و منداڵەکانی بەخێو دەکرد، زۆر لەگەڵیان دڵنەرم و لێبوردە و پیاوچاك بوو، ژنەکەش بەرەبەرە ویژدانی دەجولاو ڕۆژانی تاوانی گۆلکەکەی و پەنجە خواردنەکەی ئەو شێرە کوڕەی بەبیر دەهاتەوە و ویژدانی ئازاری دەدات.

بۆیە ڕۆژێك دیتی ئەو کوڕە ستەملێکراوە وا لە کۆڕێکی ناو خزم و کەسەکانی خۆی دانیشتبوو ویقاری لێدەباری بەناو لەپ و تەنها پەنجە گەورەکەی بەزەحمەت فنجانی قاوەی بەرەو دەمی بەرز دەکاتەوە و ژنەکەش زۆر لەخۆی تەریق بووەوە وویژدانی ئازاری داو بە هەموو دەنگی هاواری کرد و چووە ناو دانیشتنەکە، یەکسەرداخ و کەسەرو بێ باکی و بێویژدانی خۆی گێڕایەوە کاتێك کەپەنجەکانی ئەوکورە بەساوایی چۆن گۆلکەکە خواردی وئەویش

پارێزگاری لیٚ نەکرد،بۆیە پەشیمانی خۆی دەربڕی و نهێنیەکانی ئاشکرا کردو زۆرداوای لیٚ بووردنی لەو کوڕە دڵفراوانە و بەخشندەیە کرد، ئەوجا دوای سیٚ ڕۆژ لە داخ و کەسەر سەری نایەوەوکۆچی دوایی کرد.

بەلیٚ ویژدانی ئەم ئافرەتەئازاری زۆری چێشت بەهۆی ئەم تاوانەی ئەنجامی دابووبەرامبەرئەم مەلۆتکە ساوایە،خۆی بەستەمکاردەزانی،بۆیە لەکۆتاییدا ویژدانی هاواری لیٚ هەستاوداوای لێبوردنی لەخۆیی‌وکەسوکاری کرد، ئەمەش سەرەنجامی بێویژدانی ودلڕەقی مرۆڤە، هیوادارم هەمووکەسێکی بیٚ ویژدانودل ڕەق تازووە پەشیمان بێتەوەو وازلەتاوان بهێنێت.

# بەرهەمی خێر

پیاوێکی خێرخواز هەمیشە حەزی لەیارمەتی و کۆمەکی کردنی هەژاران‌و بێ نەوایان بوو، مانگانە موچەکەی وەردەگرت ،هەندێکی بۆ خەرجی ماڵ و خێزانەکەی دەهێشتەوە، ئەوەی دیکەی بەسەر هەژاران دابەش دەکرد هەروەها ناسراو برادەرەکانی هاندەدا کەوا دەستی یارمەتی بۆ ئەوانە درێژبکەن کەئەو پێی دەزانێت و دەیناسین وپێویستن .

ئەو پیاوە هەرچەندە موچەکەی زۆر نەبوو،بەلام زۆر دلخۆش و بەختەوەر بوو،باوەڕی وابوو کە خوا هاکاری دەکات، هەروەها ژنەکەش لە خۆی خێرخوازتر و بەخشندەتربوو زۆر هانی دەدا لەسەر کۆمەکی هەژاران و دەستگرتن و خەمخۆری نەداران،خەلکی بەرەو چاکەکاری و خێر ڕێنمایی دەکرد بەڕاستی ژنێکی چاکی هەبوو،هەروەکو پێغەمبەری خۆشەویستمان((ﷺ))دەفەرمووێت: (الدُّنيا مَتاعٌ وَخَيْرُ مَتاعِها المَرْاةُ الصّالِحَة).

واتە:دونیاهەمووی خۆشی‌ورابواردنە ،باشترین خۆشیش ئافرەتی چاکە.

ئەم پیاوەدەلێ ڕۆژێك زۆر بێ پارە بووم دەمویست بەرەو نوێژی عەسر بڕۆم ، ژنەکەگوتی لەگەل خۆت هەندێك حەفازە بۆ

منداڵەکان بێنە، منیش دەستم لە گیرفانم نا تەنها یەك دینارم پێ بوو،گوتم خوا دەروی خیرمان لێ بکاتەوە، گرنگترین کار ئێستا کاتی نوێژە،
لەمزگەوت دەستم بە نوێژەکەم کردبە دڵێکی پڕ ئومێد و زۆر لە خوا پاڕامەوە لە سوجدەدا نوزامەوە کەوا خوا دەروی خێرمان لێ بکاتەوە پێشتریش دوو ڕکات نوێژی(حاجە)م کرد دەستم پان کردەوە زۆر لە بەر قاپی خوا نوزامەوە، پاش نوێژی عەسر بە دڵنیایی و بە ئومێد بەرەو ماڵ گەڕامەوە و دڵخۆش بووم بەوەی کە خوا نائومێدمان ناکات.
کە گەیشتمە ماڵێ ژنەکەم زۆر بەدڵێکی خۆش و زەردەخەنە و ڕووگەشی پێشوازی لێکردم.
پیم گوت:فەرمووشتێکت دەوێ؟.
ژنەکەم گوتی:فەرموو.
گوتم:ئەوە چیە؟
ژنەکە م گوتی:دوو سەد دینارە!!..
گوتم:دوو سەد دینارت لەکوێ بوو؟!
ژنەکەش گوتی:ویستم جل و بەرگەکانت بشۆم چووم جلکە زستانیەکانتم هێنا و گیرفانەکانم کۆڵیەوە، ئەوەك شتێکی تێدا بێ

بیخەمە غەسالەوە بۆیە گیرفانەکانم جوان کۆڵیەوە،هەر ئەوندەم دیت ئەو(دوو سەد دینارە)لەناو گیرفانی چاکەتە زستانیەکەتدا بوو، لێرەدا پیاوی خواناس چەمایەوە و سەری خستە سەرزەوی و سوجدەی شوکرانەی بۆخوا بردو زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر بەهاناوە هاتنیوبەخشندەییومیهرەبانی بەرانبەر بەندەکانی خۆی.

بەڵێ ئەم پیاوە هەمیشە لە خەمی هەژاران دابوو، هەمیشە دەیبەخشی و بەبێ ئەوەی لە هەژاری بترسێ ، بۆیە لەو کاتەی کە کەوتە قات و قوڕیونەبوونی خوای بەخشندەش بە هانایی وەهات، چونکە هەرکەسێك بە هانای برایی موسڵمانی بچێ خواش بە هانایەوە دەچێ و هەر کەسێك لەیارمەتی بەندەکانی خوا بێت خواش پشت و پەنایی دەبێ، ئەوەندەی پێ دەبەخشێ کە لە خەیاڵی و بیری دانە هاتبێ هەروەکو خوایی گەورەدەفەرمووێ:

﴿ .....وَمَن يَتَّقِ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّهُۥ مَخۡرَجٗا ﴿٢﴾ وَيَرۡزُقۡهُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَحۡتَسِبُۚ وَمَن يَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِ فَهُوَ حَسۡبُهُۥٓۚ....... ﴿٣﴾ ﴾ الطلاق: ٢ - ٣

واتە:هەرکەسێك باوەرداربی بەخواورۆژی دوای ولەخوا بترسێ و خۆپارێز بێ خوایی گەورەش دەروی رزگاری لێ دەکاتەوە ،وە ئەوەندە ی پێ دەبەخشێ کە هەربۆی هەژمارنەکردبێ.

## چارەنوسی چاوچنۆكی

موسلمانێك دەگێڕێتەوە و دەڵێ:دراوسێیەكی پیرمان هەبوو ژنی ومندالی نەبوو، پینەدۆزی دەكرد،زۆر ڕەزیل بوو،هەر پارە و زێڕی لە سەر یەك دادەنا و كۆی دەكردەوە،ڕۆژێك دووكانەكەی نەكردبۆوە.

شەوێك پاش نوێژی عیشا چووم سەری لێ بدەم كە گوێ ی لە خشە خشم بوو هاواری كرد ئەوە كێیە؟

گوتم:منم....گوتی:چیت دەوێ؟

گوتم:دیار نەبووی هاتوومە سەردانت بكەم.

زۆر بەتوڕەیەوە وەڵامی دامەوە و دەری كردم،ڕۆیشتم بەلام گوتم ڕەنگە شتێكی لێ قەومابێ، گەڕامەوە و بەنهێنی گوێم لێ گرت و لە پەنایەك ویستم چاودێری بكەم، بزانم چی لێ قەوماوە!هەستی بەمن نەكرد، دیتم لیرەكانی هەمووی دەرهێنابوو لە دیار چراكەی دەبریسكانەوەودەیگوت:ئای لیرەزێر و پارەكانم چەندم خۆش دەوێن،نایەڵم بۆ كەس بن تەنها بۆ خۆم و ماچیانی دەكرد! هەندێك زەیتیشی لەلای خۆی دانابوو،دینارە زێڕەكانی پێ چەور دەكرد و دەیگوت:بشمرم دەبێ هەر لەلای خۆم بن و زۆر پێتانەوە ماندوو بوومە ئەوجا پاشان قووتی دەدا و دەستی دەكرد بە كۆخە

کۆخ، هەروەها دیناره زێڕەکانی بەو شێوەیە یەك بە یەك قوتی دەدا ،منیش هەروا چاوم لێیە،لە دڵی خۆمدا گوتم:دەردت لە گیانم ئەو لیرە زێرانە بۆ من باشن و ڕۆیشتم و بە جێم هێشت و دەرگاکەم بەسەری داخستەوە بۆ ئەوەی کەسی دی نەیبینێ.

پاش سێ ڕۆژ،چوومەوە سەری لێ بدەمەوە بزانم چی بەسەر هاتووە ، دیتم مردبوو و ڕەق ببوەوە، منیش خەبەری خەڵکم داو هاتن و شوشتیان و کفنیان کرد وە هەڵمان گرت بەرەو گۆرستان ،هەرچەندە زۆر چرچ و لاواز بوو،بەلاّم تەرمەکەی زۆرقورسو گران بوو لەبەر ئەوە ئەو هەموو زێڕەی کە قووتی دابوو،بەلاّم کەس ئەو نهێنیەیی نەدەزانی تەنها خۆم نەبێ دەنگم نەکرد.

کە شەو داهات و خاکەناسێکم هەلگرت و بەتەنها بەرەو گۆڕەکە بەڕێ کەوتم، هەرچەندە زۆر دەترسام و خەڵك بمبینن،دەستم کرد بەهەڵدانەوەی گۆڕەکە هەتا گەیشتمە تەرمەکە،و زگم هەڵدری،وە زێڕەکان لە بەر تریفەی مانگ دەبریسکانەوە،بەپەلە دەستم بۆیان برد،بەلاّم وەکو پشکۆیەکی کارەباوئاگر لە دەستمیانی دا دەستم سوتاو و هاوارم کردو لە گۆڕەکە دەرپەڕیمە دەرەوە، بەپەلە بە خۆڵ و بەردەگە گۆڕەکەم پڕکردەوە،وە گەڕامەوە ماڵ دەستم کرد

بەتیمار کردنی دەستە سوتاوەکەم و چەندان ساڵ بوو لێم تازە دەبۆوە و بەژان دەهاتەوە.

﴿ وَٱلَّذِينَ يَكْنِزُونَ ٱلذَّهَبَ وَٱلْفِضَّةَ وَلَا يُنفِقُونَهَا فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ أَلِيمٍ ﴿٣٤﴾ يَوْمَ يُحْمَىٰ عَلَيْهَا فِي نَارِ جَهَنَّمَ فَتُكْوَىٰ بِهَا جِبَاهُهُمْ وَجُنُوبُهُمْ وَظُهُورُهُمْ هَٰذَا مَا كَنَزْتُمْ لِأَنفُسِكُمْ فَذُوقُوا۟ مَا كُنتُمْ تَكْنِزُونَ ﴾ التوبة: ٣٤ - ٣٥

واتە:ئەوانەی کە زێڕو زیو(پارە)کۆدەکەنەوە و لەسەر یەکتری دادەنێن و،لە پێناوی خوا نایبەخشن و ئەوە مژدەی سزایەکی پڕ ئێشیان بدەنێ،کە ڕۆژێك دێت لە ئاگری دۆزەخ نێو چاوان و تەنیشت و پشتیان پێ داخ دەکرێ پێیان دەگوترێ دەبچێژن بەوەی کە لە پارەو سامان و (زێڕ و دۆلار لە قاسەکانتان) لەسەر یەکتان دانابوو نەتان دەبەخشی(پەنا بەخوا).

# پیلانەکانی شەیتان

ئەنوەر گەنجێك بوو،کە لە زانکۆ دەرچوو باوکی ئوتومبێلێکی بە دیاری بۆ کڕی،بەڵێنی پێدا کە ژنی هێنا ڤێلایەکیشی بە دیاری بداتێ،باوکی ئەنوەر بەڵێندەرێکی دەوڵەمەند بوو،کاتێك کە پرۆژەیەکی گەورەی حوکمی گرت،کچە ئەندازیارێکی زۆر جوانی لەسەر بوو،بە تێپەڕ بوونی ڕۆژگار پەیوەندی لەگەڵ ئەو کچەدا پەیدا کرد،هەرچەندە باوکی ئەنوەر تەمەندار بوو،بەلاّم بەپارە و دیاری زۆر کچەکەی هەڵخەڵەتاند و چەواشەی کرد، شەیتانیش هەر لە نێوانیاندا هاتوو چووی دەکرد،تا وای لێ هات پەیوەندی سێکسیشیان لەنێوانیاندا پەیدا بوو، کچەکە زگی لە باوکی ئەنوەر پڕ بوو،لەو کاتەدا زگەکەی بووە دوو مانگی بۆیە لەترسی ئاشکرابوونی پێش نیازی کرد کەوا ئەو کچە بۆ ئەنوەری کوڕی داخوازی بکات،بەلاّم ئەنوەر بەتوڕەی ڕەتی کردەوە،چونکە پێشتر لە کۆلێژی ئەندازیاری ئەو کچەی دەناسی و دەیزانی ئەو کچە سوکە و پەیوەندی لە گەڵ چەندان کوڕدا هەبووە،کچەکەش لە ترسان و لە ناچاری ڕازی ببوو شوو بە ئەنوەر بکات ئەوجا زگەکەی چواند،باوکی ئەنوەر دەستی کرد بەڕازی کردنی ئەنوەر بەهاوسەرگیری ئەو کچە و بە هەموو شێوەیەك هەوڵی لە گەڵیدا

چڕ کردەوە،بەڵام ئەنوەر هەر بەتوندی ڕەتی دەکردەوە،باوکەکەش بەردەوام بوو هەڕەشەی لێ دەکرد کە ئەگەر نەیخوازێ ئەو ڤێلاو ئوتومبێل و نوسینگەکەی لێ دەستێنێتەوە و لە هەموو شتێك بێ بەشی دەکات،بۆیە ئەنوەر بەناچاری ڕازی بوو کچەکەی مارە کرد و گواستیەوە،ڕۆژان هاتن و چوون کچەکەش زگی بوو جمکێکی کوڕ و کچی لە سکی دابوو،کەسیش نەیدەزانی کە ئایا ئەو کۆرپەلانە لە ئەنوەرن یان لە باوکی ئەنوەر!!؟ بەڵام پەیوەندی نێوان بووك و خەزورەکە هەر بەردەوام بوو،باوکی ئەنوەر زۆر جار ئەنوەری بەناوی کار و بارەکانی دەنارده ناوچە دوورەکان،بۆ سەرپەرشتی بەڵێندەرایەتی بۆئەوەی دووری بخاتەوە و دەرفەتی بۆ برەخسێ تاکو لەگەڵ بووکەکەی ڕابوێرێ، هەروەها بەردەوام بوو.

منداڵەکانی بوو پاشان هەم دیسان زگی پڕ بۆوە، ئەم جارەیان چاك دەیزانی سکەکەی لە باوکی ئەنوەرە بەڵام دەنگی نەدەکرد و باوکی ئەنوەریش بەپارە و سامان چاوی نوساندبوو هەروا بەردەوام بوو درێغی نەدەکرد لە پەیوەندی ناشەرعی و سەرجێی.

ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەنوەری ستەمدیدە و چەواشەکراو کە باوکە فێڵبازەکەی بەئەرکی ئەندازیاری بۆ ناوچەیەکی دووری ناردبوو، پێش وەختە گەڕایەوە ماڵەوە دیتی وا سەیارەی باوکی لە گەراجە

کەیە و بەسەر قادرمەکان سەرکەوتە سەرەوە چووە ژووری نوستن، دیتی وا باوکی و خێزانەکەی لەدانیشتنێکی ڕۆمانسی دان وەکو ژن و مێردبەلاَم ئەنوەر خۆی تێك نەداو بەئاسایی چووە ژوورەوە ودەنگی نەکرد و بەسەر خۆی نەهێنا هەتا باوکی ڕۆیشت، هەتا بەیانی تورەی خۆیی شاردەوە بەیانی ئەو بابەتەی لەگەڵ ژنەکەی تەقاندەوە و تاوانباری کرد کەوا منداڵەکانی لەو نین و بەڵکو بیژین ، شەڕ و هەرا کەوتە نێوانیان ، بووەمشتوڕیان تفی لە ڕووی ئەنوەرکرد و تاوانباری کرد کە پیاو نییەئەنوەریش زۆر بەتوڕەیی لە ماڵ دەرچوو و ئاگری لە چاوی دەباری بەرەو ماڵی باوکی بەرێکەوت،بەتەواوی نێوانیان تێکچوو لەگەڵ بابی کەوتە مشتو مر.

ژنەبەدبەختەکەش کەلەو پەڕی ریسوایی وبەدبەختی دابوو شێت و هار ببوویەکسەرهەستا هەر هەموو منداڵەکانی لە قاتی نۆیەمی باڵەخانەکەیان یەك یەکە فڕێ دایە خوارەو و بووە بکوژی ساواکانیش.

بەڵێ ئەمە هەمووی هۆکارەکەی ئارەزوە گلاَوەکانی بوو کە شەیتان بۆیانیانی ڕازاندبۆوە، وا بەو دەردەی بردن و دنیاو دوایی لە دەستدان سەرباری ئاشکرابوونی ڕیسوایەکانیان لەو کاتەی کەوا

تەرمی ئەو منداڵە ساوایانە لە سەر شەقامەکە کەوتبوون و خەڵکی تێیان وەرهاتبوون و حەپەسابون لەم ڕووداوە بەڵێ ئەمەیە پلانی شەیتان و ئارەزووی نەفسی نزم و چڵێس.

خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَتَّبِعُوا۟ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ ۚ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَٰتِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَإِنَّهُۥ يَأْمُرُ بِٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ ﴾ النور: ٢١

واتە:ئەی باوەڕداران وئیمانداران بەدوایی پیلانەکانی شەیتان مەکەون،هەرکەسێك بەدوایی پیلانەکانی شەیتان بکەوێ فەرمانی بە دامێن پیسی و خراپەکاری پێ دەکات بەدبەخت و چەواشەی دەکات. ... هەروەها خوا دەفەرمووێت:

﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ ۖ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِى دِينِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ ۖ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَآئِفَةٌ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴾ النور: ٢

واتە:زینا کەری ژنان و پیاوان هەریەکەیان سەد جەلدەیان لێ دەن و بەزەییان پێ مەکەن لەدینی خوا ئەگەر ئێوە باوەڕدارن بە خواو ڕۆژی دوایی،هەروەها باسزاکەی کۆمەڵێك لە ئیمانداران ببینن.

هەروەها پێغەمبەری نازدار دەفەرمووێت: ئیبلیس بارگەکەی لەسەر ئاو دادەنێ،ئەوجا تاقمی شەیتانەکان بەڕێ دەکات بۆ ئاژاوە

نانەوە لەناو خەڵك هەریەكێكیان ئاژاوەی گەورەتر بە خەڵكی بكات ئەوا لێ نزیكتر دەبێتەوە،یەكێكیان دێت و دەڵێ لە ژن و مێردێك نەگەڕام هەتا لێكم جیا كردنەوە ئەوجا ئیبلیسی نەفرەتی دەیگرێ و دەڵێ:ئافەرین بەڵێ تۆ،چاكترین كردەوەت كردووە.
(موسلم روایەتی كردووە)

## مارە بەجاش

خاوەنی ئەم بەسەرهاتە دەگێڕێتەوە و دەڵێ:بەدوای پاروێك خواردندا دەستم كرد بەگەڕان كەمێك ئازاری برسیەتیم هێور بكەمەوە،چوومە بازار، پیاویكم بینی كە نازو نیعمەتی هەبوونی پێوە دیار بووە پێمگوت:زۆر برسیمە و تەنها ئەگەر دانە درهەمێكم بدەیێ نانێكی پێ بكڕم خەریكە بمرم لە برسان!پیاوەكە ش زۆر بەتوڕەیی و بوغزەوە تەماشایی كردمولێمی ڕاخوڕیەوە گوتی لە پێش چاوم بزر بە!چاك بزانە من زۆر ڕكم لە سواڵكەران دەبێـەوە، من ئارەقە بڕێژم تۆش بیخۆی،بڕۆ لەبەرچاوم دەنا چاكت تێ هەڵدەدەم...

بەناچاری و بەبێ دەنگی دەولەمەندەکەم بەجێ هێشت،زورنیگەران بووم لەخۆم بێزاربووم لە خوا پاڕامەوە کە دەرگایەکی خێرم لێ بکاتەوە، بەڵێنم دا هیچیتر دەست لە کەس پان نەکەمەوە و داوا لە کەس نەکەم ئەگەر بشمرم لە برسان....ملم نابەناچاری رۆیشتم پشت بەخوا.

خۆر ئاوا بوو لامدا کەلاومیەك بەو پەڕی بێزاری و شەکەتی و ماندووبونەوە،ماندویەتی پەکی خستبوم، پاڵم داوە،چاوم چووە سەریەك کەمێك ئاگام لە خۆ بڕا،هەستم کرد یەکێك رایتەکاندم، چاوم کردەوە پیوێك لەسەرم ڕاوەستابوو: گوتی:هەستە هەستە بەدوام کەوە وەرە لە گەڵم دا!!

لەترسان ڕاپەڕیم گوتم:تۆ کێ ی وچیت لێم دەوێ؟

گوتی تۆ حەقت نەبێ ناتەوێ خواردنێکی چەور و خۆش بخۆی و لەسەر جێگایەکی نەرم ڕاکشێ ی بحەسێیتەوە؟!..........

گوتم:کاکەوازم لێ بێنەبۆپێم ڕادەبوێری خواردنی چی‌وحاڵی چی؟!

گوتی: دە تۆ وەرە خۆت بەچاوی خۆت ببینە.

بەدوایدا ڕۆیشتم منی بردە ناو کۆشك و تەلارێکی بەرز و فراوان پڕ لە باخ و باخات،کابرایەك چاوەڕێ ی دەکردم کە تەماشام کرد هەمان پیاو بوو کەپیشتر لە بازاڕ دیت بووم و بە چاوی مۆن

سەیری دەکردم،منی نەناسیەوە بەڵام من ناسیمەوە پرسی:لەکوێ دۆزیتەوە؟

گوتی:قوربان لە نزیکی ئێرە بوو...گوتی:خێرا بیبەنە گەرما وپاکی کەنەوە و پاشان ئامادەی بکەن و بیهێنەوە.

پاش ئەوەی چوومە گەرماو و جل و بەرگێکی جوانم پۆشی و هاتمەوە لای، پیاوەکە گوتی: من سێ بە سێ ژنەکەم تەڵاق داوە ئێستا لەیەکێکی مارە نەکەم و شەونەچێتە لای بۆ من ناشێ، تۆش ئەو پیاوەی دەتوانی لێت مارە بکەم و ئەمشەو برۆ لای بەیانی تەڵاقی بدە،منیش بەخشیشێکی باشت دەدەمێ کە تەواو بووی...

منیش لە کارەکە دوو دڵ بووم ، بەڵام برسیەتی تەنگی پێ هەڵ چنی بووم،خەریك بوو بزیرپێنم لە تاوی برسیەتی وماندوبوونم بەناچاری وتم:چۆنت دەوێ با وابێ!

مارە برینەکەمان ئەنجام دا، چوومە ناو ژوورێکی نوستنی زۆر فراوان و خۆش و کەوا پێخەفێکی نەرم و نیانی لێ دانرابوو و هەروەها سفرەیەکی ڕازاوە کە سەر پۆشکرابوو بە پارچە قوماشێك، هەڵم داوە و دیتم مریشکی سور کراوە و برنج و میوەجاتی لەسەر بوو، ناوی خوام لێ هێنا هەتا توانیم خواردم،بەزەیی خوام کەوتەوە بیر کە کەمێك پێشتر لە کەلاوەیەك

له برسان دەمنالاَند و ئیستاش خوا ناز و نیعمەتی لەگەڵ دا کردوم و فرمێسکم هۆن هۆن دەباری و سوپاسی خوام دەکرد پاش کەمێك هەرئەوەندەم بینی ژنێکی ناسك و نازدار و ناو قەد باریك لێم پەیدا بوو، هاتە ژوورەوە وەکو ڕووی مانگ لە جوانی دەدرەوشایەوە!!!!.....گوتم:تۆ کێی؟

گوتی:من ئەو ژنەم کە کەمێك پێش ئیستا لێت مارە کرام ، بەلاَم داواکاریەکم لێت هەیە؟

گوتم:چییە ؟ من دەمەوێ چاکەتان بدەمەوە؟؟

گوتی: تۆ زۆر پیاوێکی چاك دیاری......... تکات لێ دەکەم کە تەلاَقم نەدەیی! دەمەوێ بەیەکجاری ببمە خێزانی تۆ ، چونکە زۆر لەو کابرایە بێزارم و زۆر ستەمکار و خراپە و دەم شڕە،لە دەستی ڕزگارم بکە، هەر ناوە ناوە تەلاَقم دەدات و پاشان پیاوێك دێنێت و مارە بەجاشم دەکات، کە ئەمەش ناڕەوایە، جا پاشان کابرا بەڕێ دەکات و هەندێك پارەی دەداتێ.

گوتم:بەلاَم من پیاوێکی هەژارم و نەدارم و هیچم نییە تەنها ئەو جلەش کە لەبەرم دایە هی ئێوەیە!

ژنەکە گوتی: ئەو کۆشك و ماڵ و حاڵەی کە دەیبینی هەمووی هی خۆمە کە لە مێردەکەی پێشترم بۆم بەجێ ماوەئەگەر ڕازی بی با هەمووی بۆ تۆ بێ چونکە تۆ پیاوێکی چاك وپیاوانە دیاری!

گوتی:بەیانی بەو مێردەم بڵێ من تەڵاقی نادەم و ماڵەکەش هیچ مافی تۆی تێدا نییە، لەسەر ئەو کارە ڕازی بووم ڕێك کەوتین ئەو شەوە وەکو ژن و مێردێکی خۆشەویست زۆر بە خۆشیمان ڕابوارد زۆر بەختەوەر بووین..

بەیانی پیاوەکەبانگی کردم و گوتی:دەی زووکە تەڵاقی بدە!

گوتم:تەڵاقی نادەم و خێزانی شەرعی خۆمە و تۆ دەبێ بڕۆی.

گوتی ئەوە شێت بووی دەزانی تۆ چی دەڵێی؟

گوتم: زووکە لەم ماڵە دەرپەڕە با وەکو سەگ بە خزمەتکاران دادکاری و شاپت نەدەم.

ئەوجاپیاوەکە زۆر بەچاومۆنی و شەرمەزاری و پەشیمانیدەرچوو!

پێم گوت: بەر لەوە بڕۆی دەزانی من ئەو کەسەم کە دوێنێ تەنها درهەمێکت پێم ڕەوا نەدیت ئەو کەسەم کە لە بازاڕ توشت بووم، چەندە پارامەو تەنها نانێکت پێم رەوا نەبینی ؟!!!

ئەوجا زۆر بە چاو شۆڕی و داخ و کەسەرەوە دوا جار سەیری کردم و ماڵەکەی بەجێهیشت و سەری هەڵگرت.

بەڵێ بەم جۆر ئەم پیاوە هەژارە برسیە بە فەزلی خوا بووە خاوەنی ماڵەکە و ژنەکە، ئەوەی تریش لە ئەنجامی لوت بەرزی و بێ باکی و دڵرەقی لە خۆ بایبوونی خۆی هەموو شتێکی لە دەست چوو هاتەوە سەر ساجی عەلی وەهەردەبێ داخ و کەسەر بکێشێ و پەنجەی پەشیمانی بگەزێ.

خوای گەورە دەفەرموویێت:

﴿ هَٰٓأَنتُمۡ هَٰٓؤُلَآءِ تُدۡعَوۡنَ لِتُنفِقُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَمِنكُم مَّن يَبۡخَلُۖ وَمَن يَبۡخَلۡ فَإِنَّمَا يَبۡخَلُ عَن نَّفۡسِهِۦۚ وَٱللَّهُ ٱلۡغَنِيُّ وَأَنتُمُ ٱلۡفُقَرَآءُۚ وَإِن تَتَوَلَّوۡاْ يَسۡتَبۡدِلۡ قَوۡمًا غَيۡرَكُمۡ ثُمَّ لَا يَكُونُوٓاْ أَمۡثَٰلَكُم ﴾ محمد: ٣٨

واتە:ئەوە ئێوەن کە داواتان لێ دەکرێ دەبێ لە ماڵ و سامانەکەتان لە پێناوی خوا ببەخشن، جاتێتاندایە چروکی دەکات و جا ئەگەر هەرکەسێك ڕەزیلی بکات لە بەخشیندا ئەوە ڕەزیلی لەگەل خۆی دەکات،خوا دەوڵەمەندە و ئێوەش هەژارن جا ئەگەر پشتی تێ بکەن خوای گەورەش بە کەسانی غەیری ئێوە دەتان گۆڕێ و پاشان وەکو ئێوە نەبن و بەخشندە و خێرخوازبن (پەنابەخوا).

# دنیای فانی

هــــەر لـــــەخوا بترســــە گـــــەر زیــــر و هۆشــــیاری
خــــوا رۆزیـــــت دەدا خــــەم مــــەخۆ گەرنــــەداری

چـــــۆن دەترســــــی لەهـــــەزاری کـــــەبرواداری
خــــوا خـــــۆراکی مــــەل دەداو ماســـــی لــــەروباری

کـــــەس وانــــــەزانی رزق دەبــــــری بــــــەزۆرداری
ئەگـــــەر وابـــــا ســــتەم دەی بـــرد لـــــەدێ ولەشــــاری

کـــــە شــــــەوهات کــــێ دەڵێ دەکەیــــــە رزگــــاری
ژیـــــن بەســــــەر دەچـــێ بەخۆشــــی یـــــان هـــــەژاری

چـــەند لـــــەش ســـــاغ مــــردن لـــــەپر بـــێ دەردداری
چـــەند نـــەخۆش مـــان لـــەپاش نەخۆشـــی بـــە بـــەختیاری

چـــــەند گـــــەنج ولاو ژیـــــان بەناســـــك ونــــــازداری
بـــــەلاّم بـــــەرگی مـــــەرگیان پۆشــــــت بەناچــــاری

ئەگەر هەزار ساڵ بژی بەبەختیاری
هەر دەبێ بەرەو گۆڕ کۆچ کەی بــەیــەکــجاری

## پشت بەخوا بەستان:

لە ساڵانی گرانی لە دەوروبەری (١٩٩٦)ز کە مامۆستا بووم وەکو هەر هەموو مووچەخۆرانی کوردستان بارودۆخی ئابووریم زۆر خراپ بوو،لەبەر کەمی موچە و بەردەوامیش بووم لە پیشەی مامۆستایەتیم ڕۆژێکیش هیچ ئامادە نەبووم دەوام بەجێ بێڵم لە بەر کەمی موچە ، بەڵکو زۆر بە دڵسۆزی و لێ نەبڕان دەوامی خۆم دەکرد،بە تایبەتی لەو کاتەی کە شەش مانگ موچە نەدراسەری بەرزم بۆ موچە نزم نەکرد،بۆیە توشی قات و قڕیەکی گەورە بووم ناچار بووم بیر لە خانووەکەم بکەمەوە کە بیفرۆشم ، بۆیە بە نیوە نرخی خۆی خانوەکەم فرۆشت،پاش ئەوەی ماوەی دوومانگ مانەوەم تەواو بوو ناچار دەستم کرد بە گەڕان بە دوایی خانووەکی کرێدا،دەستم نەکەوت و خاوەن خانوەکەش داوایی لێ کردم کە خانوەکە چۆڵ بکەم، خاوەنی کۆمەڵێك خێزان بووم، بۆیە جیرانێکمان هەبوو گوتی: خانوێکی خۆشی چۆڵ هەیە تەنها ژورێکی ماڵی خاوەن خانوەکەی تێدایە و خاوەنەکەشی وا لە (پیرمامە) حەز دەکەم ماڵەکەت ببەیە ناوی ، تۆ مامۆستایەکی بێ لایەنی و هیچ گرفتت نیە کەس شەڕت پێ نافرۆشێ و دەتوانی

بچیه ناوی و هەر کرێش نەدەی،تەنها چاوت لە خانوەکە بێت هەتا تێیدا دەبیت تێدا بە،منیش لە ناچاری زۆر سوپاسم کرد و ماڵەکەم بار کرد چوومە ناوی.

پاش ماوەیەك تێدا بووم کرێ ی خۆم دەدا و هیچ گرفتێکم نەبوو،لەناکاو لە کۆتایی مانگی ئاب چەند چەکدارێکم لێ پەیدا بوو،گوتیان دەبێ ئەم خانووە چۆڵ بکەی لەبەر ئەوەی ئەو خانووە خانووی بەرپرسی(لایەنێکە) ، ئێمەش نەفەرمان لای ئەوان ئاوارە کراوە، ئێمەش خانومان لای ئەوان داگیرکراوە ،بۆیە ئێمەش ئەو خانووە داگیر دەکەین و تۆش دەبێ بار بکەی،(لە ڕاستیدا ئەو خانووەیان بۆ ژنێکی بێوەژن بوو کە لە ناوچەی زەرد دەرکرابوو)،منیش پێم وتن من هیچ پەیوەندییەکم بە سیاسەتەوە نیە پیاوێکی مامۆستای بێ لایەنم و من بەکرێ لەم خانووە دام خاوەنەکەی هەر ناناسم و من داگیرم نەکردووە و بەڵکو کرێ ی خۆشم دەدەم و، لە ناچاری هاتومەتە ناوی،هەر کاتێکیش خانووم دەست کەوت بار دەکەم و ئێوەش ئەگەر دەتوانن خانوێکی کرێم بۆ پەیدا بکەن هیچ لاریەکم نییە کە بڕۆم،چەکدارەکانیش زۆر بە بێ باکی و بێ منەت گوتیان: ئێمە هیچ بەرپرس نین کە خانووت بۆ پەیدا بکەین و تەنها ماوەی سێ ڕۆژ مۆڵەتت دەدەینێ کە ئەم

خانووه چۆڵ بكەیت،پاش ئەو سێ ڕۆژه خۆت بەرپرسی،ئەگەر نا ماڵەكەت فڕێ دەدەینە دەرێ هەرچی خراپیش بێ پێت دەكەین.
منیش گوتم: بەو سێ ڕۆژه هیچم پێ ناكرێ و ناتوانم بار بكەم هەرچیش دەكەن بیكەن، چەكدارەكان ڕۆیشتن و گوتیان:ئەوه دوا مۆڵەته و چارەسەری خۆت بكە،لەو ماوەیەدا كەوتمە دڵەڕاوكێیەكی زۆر  و بەلاَم هەمیشه خوام هەر لە بیر بوو كە هەرچی خوا بیەوێ هەر وا دەبێ، لەو ماوەیەدا هەمیشه نوێژەكانم هەروەكو پێشتر لە مزگەوت دەكرد زۆر دوعاشم دەكرد و زۆریش دەپاڕامەوه كەوا خوا دەرگایەكی خێرم لێ بكاتەوه(لە كاتی پاڕانەوەكانم هەستم دەكرد كە هەموو گیانم گەرم دادەهات).
لەو ماوەیەدا چەند برادەرێك چەند ڕێگا چارەیەكیان پێ نیشان دام، وەكو ئەوەی ناوی چەند بەرپرسێكیان دامێ كە بچمە لایان و لایان بپاڕێمەوه، بەلاَم هەمووم ڕەت كردەوه و گوتم من تەنها خوام هەیه و ناچمە بەر دەرگایی هیچ كەسێك و تەنها لەبەر قاپی خوا دەپاڕێمەوه و دەرگایی ئەو دەگرم،مۆڵەتەكەم بەسەر چوو چاوەڕێم دەكرد كە چەكدارەكان بێنەوه و هەرچی خراپە پێم بكەن،بەلاَم پشتیشم بە خوا هەر قایم بوو،لە بەرە بەیانی ئەو ڕۆژه كە من هیچ ئاگام لە پشتەوەی پەردەی سیاسەت نەبوو،هەر

ئەوەندەم زانی گرمە گرم و دەنگی تەقە و شەڕ دەستی پێ کرد،منیش هیچم نەدەزانی کە چ بووە بەڵام خەڵکەکە گوتیان وا دنیا خرابوونە و تانك و زریپۆش هاتنە ناو شار و هەر ئەوندەم دیت ئەوانەی کە دوێنێ و پێرێ کە هەڕەشەیان لێ دەکردم کە هەرچی خراپە پێم بکەن،هەر ئەوەندەم دیت هەریەك بەلایەك دا ڕادەکات و کەس بەکەس نییە و براش نابێتە برا ئەو ژنەی کە بەتەمایی خانوەکە بوو دیتم لە کۆڵانەکە کە دەستی منداڵەکانی گرتبوو بەگریان تێدەپەڕێ وبەکورتی هەتا ئێوارە بار و دۆخی شار گۆڕاو ئەوانەی کە هەتا دوێنێ دەسەلآت دار بوون و خەڵکیان ئازار دەدا، ئەوانەی خەڵکیان شار بە دەر دەکرد و خەڵکیان دەگرت، ئەوە ئەمڕۆ لەو پەڕی بێ دەسەلآتی و شەرمەزاری ڕادەکەن و شار چۆڵ دەکەن هەتا ئێوارە بەتەواوی شاریان چۆڵ کرد و شاریان لێ پاك بووە و منیش زۆر شوکرانەی خوام کرد کە بەتەنها ڕۆژێك بارودۆخەکەی گۆڕی و منیشی ڕزگار کرد لە ماڵ کاولی و هەڕەشە و گورەشەوستەمی ئەم چەکدارانە، وابزانم وەکو بیستم چارەنوسی چەتەکانیش رەش بوو ئەو رۆژەش (٣١ئابی ساڵی ١٩٩٦)بوو ، ئەو ڕۆژە بووە ڕۆژێکی مێژووی وهەندێك بە ڕۆژێکی گەشی دادەنێن وهەندێکیش بە ڕۆژێکی ڕەشی لەقەڵەم دەدەن،

بووە گۆڕانکاری و وەرچەرخانێك لە مێژووی برا کوژی،(زەردەکان ئەو ڕۆژە بەرۆژێکی بەختەوەر دەزانن و سەوزەکانیش بە رۆژێکی شوم وبەدبەختی دادەنێن لە ژیانی خۆیاندا) بەڵێ ئەمەیە سەرەنجامی ستەم کاران و زۆر داران هەر وەکو خوداش ئاماژەیی پێ کردووە ودەربارەیان فەرموویەتی :

وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱللَّهَ غَـٰفِلًا عَمَّا يَعْمَلُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ۚ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ ٱلْأَبْصَـٰرُ ﴿٤٢﴾ مُهْطِعِينَ مُقْنِعِى رُءُوسِهِمْ لَا يَرْتَدُّ إِلَيْهِمْ طَرْفُهُمْ ۖ وَأَفْـِٔدَتُهُمْ هَوَآءٌ ﴿٤٣﴾ وَسَكَنتُمْ ﴿٤٥﴾...... فِى مَسَـٰكِنِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ وَتَبَيَّنَ لَكُمْ كَيْفَ فَعَلْنَا بِهِمْ وَضَرَبْنَا لَكُمُ ٱلْأَمْثَالَ ﴿٤٥﴾ ابراهيم

واتە: ئەی پێغەمبەر ئەی ئیماندار: وا گومان مەبەن کە خوا بێ ئاگایە لەو کردەوانەی ستەمکاران دەیکەن بەراستی خوا سزاکەیان دوا دەخات بۆ ڕۆژێك چاوەکان تێدا ئەبلەق دەبن(جاریش هەیە لە دونیا ستەمکاران ریسوا دەکات وتۆڵەیان لێ دەستێنیتەوە)، بە پەلە وشپرزەیی دێن، وسەریان بەرز کردۆتەوە لە ترس وسامناکی ئەو ڕۆژە چاویان ناتروکی ودڵە ڕاوکێیانە ودڵ ودەرونیان بە تاڵەو لە

هیچ حالی نین.......... ئێوه كاتی خۆی نیشتەجێ بوون له ماڵ وشوێنی ئەوانەی كه ستەمیان له خۆیان كرد و(ڕێگەی ئیمان وخواناسینیان نەگرت) بۆتان بەدەركەوت كه چیمان بەسەریان هێنان نموونه وباسی زۆرمان بۆ هێناونەتەوه (دەربارەی سەر ئەنجامیان). ..هەروەها پێغەمبەر(ﷺ)دەفەرموویت:
(مَنْ لا يَرحَمِ النَّاس لا يَرحَمْهُ الله).
واته:هەر كەسێك ڕەحم به خەڵك نەكات خواش ڕەحمی پێ ناكات.
بەڵێ ئەمەیه سەرەنجامی هەموو ستەمكارێك تەنها له دونیادا ،لەو دونیاش ستەم كار ڕوو ڕەش و تاوانبارو خەسارمتمەندە، هەروەكو پێغەمبەری خۆشەویستمان ﷺ دەفەرموویت:(اِتَّقوا الظُّلْمَ فَاِنَ الظُّلْمَ ظُلْماتُ يَوْمُ القيامَةَ). واته:خۆتان له ستەم بپارێزن چونكه ستەم له ڕۆژی قیامەت تاریكستانه.
هەروەها دەربارەی پشت بەستانی بەنده به خوا له خۆشی و ناخۆشیدا مزگێنیمان دەداتێ كەوا هەمیشه پشت بەخوا ببەستین هەروەكو دەفەرموویت: (وَمَنْ يَتَوَكَّلْ عَلَى الله ِفَهُوَ حَسْبُهُ).
واته:هەركەسێك پشت به خوا ببەستێت بەڕاستی هەر خوا بەسیەتی و چارەسەری كێشەو پێداویستیەكانی دەكات.

# ئیستیغفار

ئافرەتێك گێرایەوەو گوتی:مێردەکەم یەکجار لەگەڵمدا خراپ بوو،زۆر قسەو جوێنی ناشرینی پێ دەگوتم ، هەمیشە سوکایەتی پێدەکردم ،کەدەهاتەوە ماڵ بێجگە لە زەحمەتی وهەراسانی هیچی تری نەبوو،مێرد نەبوو،بەڵکو دوژمنێکی بەڕاستی بوو، ژیانی لێ کردبوومە دۆزەخ، ماڵەکە لەمنداڵەکانمان ببووە زیندان، منداڵەکانیش لەگەل من لەوپەری چەرمە سەری دەژیان ،وبەڕادەیەك خەرجی منداڵەکانیشی نەدەکرد وەکو ئەوە بووکە فاڵ وسحری لێ کرابێ زۆرلێ ی بێزاربووین ، مردنم پێ خۆشتربوو لەو ژیانەی لەگەڵ ئەم مێردەمدا بە لاّم قەت بێئومێدیش نەبووم لەوەی کە ڕەنگە مێردەکەم ڕۆژێك دابێ چاك ببێ وبگۆڕێ،ئەم بەسەرهاتەی ئیمامی ئەحمەدم لە مامۆستایەك بیست دەیگوت:ئیمامی ئەحمەدلە بەسەرهاتی ژیانی خۆی دەگێڕێتەوەودەڵێ:لەشارەکەم دەرچووم بەسەفەر،لە ڕێگاداکەشەوم بەسەر دا هات ناچار لامدا ئاواییەك بۆئەوەی شەو لەوێ

بمێنمەوە،چومە مزگەوتی ئاواییەکە لەوێ نوێژی عیشام کرد،کەس لەوێ نەناسم، بۆیە کە نوێژ تەواو بووهەر کەسەودەڕۆیشت وکەسیش منی نەدەناسی ،تا وای لێهات خەڵکەکەهەمووپەرتەیان لە مزگەوتەکە کرد، منیش بەتەنییا مامەوە ، تەنهاپیاوێك لەوێ مابووئەویش نانەوایەك بوو،گوتی لێرە غەریبی گوتم بەڵێ گوتی :دەفەرمووومێوانی من بەوبا لەخزمەتتدابم ئەمشەو،زۆر سوپاسم کردولەگەڵی داچوومە ماڵێ،سەیرم کردپیاوەکی زۆر دیندار ولە خوا ترس بوو،هەمیشە ئیستغفاری دەکردوزمانی بە ئیستغفار گرتبوو،شەووڕۆژ هەر دەیگوت (اَسْتَغْفِرُ الله وَاَتُوبُ اِلَیْه)خوایە پەشیمانم خوایە تۆبە هەروا ڕاهاتبوو، منیش لێم پرسی برا گیان تۆ بەڕاستی زکرێکی چاك دەکەی ئافەرین ،بەلاّم پێم نالّی چ سودێکت لەم زیکرەکردیە، خانە خوێش گوتی:بەڕاستی مامۆستا من لە سایەی ئەم زیکرەی خوا لەم دنیایەدا هەرچی داواکاریم داوا کردبێ لەخوا، هەموو شتێکی پێ بەخشیوم و ئاواتەکانم هەمووی هاتۆتە دی ودوعا کانیشم هەموو جێبەجێ بوونە ،تەنها ئاواتێکم ماوە کە نەهاتۆتە دی، گوتم ئەو ئاواتە چییە؟

بێگومان ئەو پیاوە منی نەدەناسی ومنیش خۆم بۆی ئاشکرا نەکردبوو،گوتی زۆر لە مێژە ئاواتمە کە (ئیمامی ئەحمەدی کوری حەنبەل )ئەوزانا بەرزو بەڕێزە ببینم،بەلاّم هەتا ئێستا نەمبینیوە ونایناسم .........

منیش پێم گوت:دەبە خوا ئەو ئەحمەدەی کەتۆ ئاواتە خوازی بیبینی  من خۆمم و ئەوە لە خزمەتدامە ،ئەوجا پیاوەکەزۆر سوپاسی  خوای کردو زۆر کڕنۆشی شوکرانەی بۆ خوا برد کە ئەو ئاواتەشی هاتە دی: ئەوجا ژنەکە دەڵێ لەو بەسەر هاتە فێربووم کەوا زۆر ئیسغفار بکەم وهەر بەردەوام وەکو ئەو پیاوە هەر ئستغفارم دەکرد وسوودم لەم بەسەر هاتە وەرگرت ، چەند ڕۆژێکی نەبرد بەخوا پیاوەکەم یەکسەر گۆڕاو چاك  بوو،زمانە شڕەکەی ببووەزمانی گوڵ وکردەوەناشرینەکانی بوونە  خۆشەویستی و بەختەوەری  سۆز وسوکنایی بۆ خۆی وخۆموخێزانەکەم ، سوپاس بۆ خودا ئێستاش خێزانێکن زۆربەبەختەوەری و ئاسوودەیی دەژین.

ئێمەش دەڵێین بەڵێ ڕاستی فەرمووە پێشەوای مرۆڤایەتی(مَنْ لَزِمَ الاسْتِغْفارَ جَعَلَ اللهُ لهُ مِنْ كُل ضَيْقٍ مَخْرَجاً وَيَرزُقهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبْ)واتە:هەر كەسێك هەمیشە بە ئستغفارەوە پەیوەست بێت خواش لە هەموو تەنگانەیەك دەربازی دەكات وبەبێ حیسابیش ڕزق وڕۆزی دەدات....

## بەخشین

(عبداللەی كوڕی موبارەك )دەڵێ: لەوكاتەی لەحەج بووم شەوێك نوستبووم لەخەودا بینیم دووفریشتەی بەرگ سپی هاتنەلام، لەسەرم ڕاوەستان، یەكێكیان لەوی تری پرسی ،ئەم ساڵ چەندكەس هاتوونەتە حەج ؟ئەوی تر وتی:- شەش هەزاركەس، تێبینی: (ئەوبەسەرهاتەش هەزارساڵ بەر لەئێستا زیاترە)

وتی:- چەند كەسیان حەجیان قەبوول بووە ؟ وتی تەنها (كەمترلە٢٠٠حاجی)حەجیان قەبووڵ بوە ،بەڵام خوای گەورە لەبەر خاتری پینە دۆزێك كەناوی (عبدااللەی كوڕی مۆفەقە)خەڵكی شامە خوا حەجی گشت حاجیانی قبوولكردووە، هەرچەندە

نەهاتۆتە حەجیش، کوری موبارەك دەڵێ:-کەگەڕامەوە چووم بۆ دیمەشق حاجی پینەدۆجم دۆزییەوە چووم بۆلای و باسەکەم بۆگێڕایەوە پێم گوت کاکی پینەدۆز بگرێی و سوژدەی شوکرانە ببەو بپارێوە تۆچیت کردووە سوپاسی خوا بکە !! دەڵێ پێم وت توخوا تۆچیت کردووە خوای گەورە ئاوارێزی لێناوی ؟؟

دەڵێ : ئەی کوڕی موبارەك چەندان ساڵ بوو کاسبیم دەکرد تاپارەیەکەم پەیداکرد پێی بچم بۆماڵی خوا حەج بکەم،رۆژێك بۆنی گۆشتێکی خۆش لەماڵە دراوسێیەکەمان دەهات ،منیش چووم پێم گوتن گەربکرێ تۆزێك گۆشتم بدەنێ!!بەلام خاوەن،ماڵەکە هەتیووی هەبوو گوتی : ئاخر ئەم گۆشتە مردارە بۆتۆحەرامە.....

بەلاّم بۆئێمە حەلاّڵە چونکە هیچمان نیە زۆر هەژارین و لەناچاری دەیخۆین" گوتی: لەدەوروبەری ئاوای چێڵێکی مردار هەبوو،منیش کەمێك گۆشتم لێ کردەووەو هێنام بۆ منداڵە کانم بکولێنم بۆئەوی لەبرسان نەمرن!!!. جا ئەوپیاوە دەستی کرد بەگریانێکی قووڵ گوتی خۆشەویست(ﷺ) فەرموویەتی:(اِرْحَمُوامَنْ في الَارْض يَرْحَمْكُم مَنْ في السَّماء). واتە:رەحم بەخەڵکی سەرزەوی بکەن

خواش ڕەحمتان پێدەکات.دەڵێ منیش هەمووئەو پارەی کەحەجم گرتبوو هەموویم دا بەوماڵە هەتیووەو حەجەکەم نەکرد ئەوەیە بەسەرهاتەکەم  بۆیە خوای گەورەش وارێزی لێناوم ...

## خێرخوازی

هـــــەبوونی کەدەرفـــــەتیی بەخشـــــین وســـــۆزە

کـــاری خـــیر خـــوازی تێیـــدا بـــەرزو پـــیرۆزە

ســـــابقوا الی مغفـــــره مـــــن ربکـــــم

ببەخشـــن موســـلمانان زۆر بـــێ یـــا کـــەم

هـــەر موســـلمانێك خێـــرو چـــاکە زۆر بچـــینێ

بـــۆ دونیـــا و دوایـــی پـــێش خـــوی دەبینـــێ

هـــەر کەســـێك دەیـــەوێ بـــەڕزگاری بگـــات

باکـــەم تەرخـــەمی لـــەخێرو چـــاکە نـــەکات

هـــەر کەســـێك لـــە دونیـــا بـــێ نازیـــك بـــەرگ بکـــات

خـــواش لـــە بەهەشـــت بەســـوندس بـــەرگی دەکـــات

بـــڕواو بـــەخیل لـــە دلێـــك کـــۆ نابنـــەوە

دەســـتی بەرزچـــاکترە لەدەســـتی بنـــەوە

خێـــر خـــواز بەپێغەمبـــەر دەگەشـــێتەوە

بەخشـــندە لەبەهەشـــتدا دادەگیرســـێتەوە

٢٠/ڕەمەزانی/٢٠٠٠

# تەکسی

پیاویك گێڕایەوەگوتی:لەسالانی نەوەتەکان کاتێك گرانی یەکی زۆر گەورە بووفاتوقری بوو خەڵکێکی زۆر نەدارو هەژاربوون، لەو کاتەدا شرە تەکسیەکی لادەم هەبوو ،زۆر کەچەو تایەکانی فەوتابوون، بەهەزار ڕاکە ڕاك هەندێك پارەم کۆکردەوە ، تاکو دووجۆت تایەی پێ بکرم ، چونکە زۆر جار پەنچەر دەبوو و پەکی دەخستم ، ڕۆژێك بۆکاسبی دەرچووم وبەژنەکەم گوت ئەوڕۆ چوارتایە دەکرم کەدەرچوم ژنێك دەستی لێڕاگرتم و ڕاوەستام ویستی بێتە پێشەوە لام دانیشێ ،منیش زۆرم پێناخۆش بوو پێمگوت: خوشکم لێرەدامە نیشە ،فەرموو برۆ پشتەوە ئێرە جوان نیە بۆ تۆ چونکە تۆ نەفەری و هیچی من نیت زۆر داوام لێکرد چوە پشتەوە سواربوو پێمگوت دەچیە کوێ؟ گوتی :برۆ دەمبەیە کوێ ڕازیم بۆ خۆشت ڕابوێرە منیش پێمگوت :خوشکم ئاخر حەرامەو من ئیشی خراپ ناکەم خاوەن خێزانم ئەوشتانە لەمن ناوەشێتەوە دابەزە زۆر ئامۆ ژگاریم کرد ژنەکەش دەستی بەگریان کرد و گوتی بەخوا منیش لەو ژنانە نیم لەژیانم قەت کاری خراپم نەکردوە ........بەلام بێوەژنێکی خاوەن کۆشێك منداڵی هەتیوم چەند کچێکی حازەبیشم هەیە ، نانمان لەو ماڵەدانیە زۆربێچارەو

و نەدارو هەژارین والەبرسان دەمرین بۆیە ڕوم لەو کارە ناوە کەناچاری........ منیش پێمگوت :ئەگەر ڕاستدەکەی بمبە ماڵەکەتان وتەماشای حاڵتان بکەم بزانم ڕاستدەکەی ئەگەر وابو یارمەتیت دەدەم ،پێکەوە چوینە ماڵی ژنەکە دیتم کە لاوەیەك بوو کۆمەڵێك منالً وکچی تێدابوو لەخۆیان بێچارەو برسیتر نەبوون، زۆر دڵم پێیان سوتا و پێمگوت دەچم هەندێك خواردنتان بۆدێنم چوم هەندێك خواردن ومەکینیەکی دورمانم بەو پارەی کە بۆ تایە کرینم دانابوو کریم و بردمە ماڵەکە ،ئەو پارەی هەشم بوو دامە دەستی ژنەکەو گوتم دەتوانن بەم مەکینەیە دورمان بکەی بۆ خەڵکی بەرگ بدووری بەکچەکانت کاری پێ بکەی و بەجێم هێشت ،زۆر دڵیان خۆش بوو زۆردوعایان بۆکردم ،چومەماڵەوە ژنەکەم گوتی کواتایە ؟ گوتم پارەم داوە هێشتا نەیان هێناوە چەند ڕۆژیکی پێچوو کەدەچومە وە ژنەکەم دەیپرسی کوا تایە؟ دمگوت هێشتا نەیان هێناوە چەند ڕۆژێکی پێچو کەچومە ماڵەوە دیتم چوارتایەی لەناو پاکەت لەهەیوانەکەمان دانرایە ، بەژنەکەم گوت کێ ئەو تایانەی هێناوە؟ گوتی پیاوەك هێنای ناونیشانی خۆی بەجێهێشت ئەوەش ئەدرێسەکەیتی منیش بە دوای ناونیشانەکەداچووم ،دیتم دوکانێکی تایە فرۆشی زۆرگەورەبوو

چومە لایفرۆشیارەگەو پێمگوت " تۆ ئەو تایانەت هێنا ماڵەکەم ؟ گوتی بەڵێ گوتم :ئاخر چۆن هێنات و کێ پێی گوت ی؟ خۆمن تۆ ناناسم ، پیاوەکەش گوتی :ـ تۆ حەقت نەبێ ئەوە دیاری منەو هیچیشم وناوێ گەردنت ئازابێ گوتم بەخوا تایەکان لەتەکسیەکەم ناگرم وئەگەر پێم نەڵێی نامەوێ ئێستا دەتدەمەوە دەڵێ گوتی کاکە سوێندت دەدەم کەلای کەس باسم نەکەی و ناونیشانم نهێنیە ك بێ لەنێوانماندا وبەس......سوێندم بۆی خوارد کەئاشکرای نەکەم و لای کەس ناوی نەبەم بەڵێنم دایێ....... خاوەن تایەکە گوتی : کاکە ئەم شەو بەخزمەتی پێغەمبەری خودا( ﷺ) شادبووم پێی فەرموم بەیانی برۆ چوار تایە بۆ فلأنەکەس ببە، ناونیشانی تۆی دامێ ئەوە بەسەر هاتەکە یە و لای کەسیش باسی من مەدرکێنە پیرۆزت بێ و خواحافیزتبێ ،منیش تا ئێستا ناوی کابرام نەهێناوە و کەس نازانی کێیە........ ئێمەش دەڵێین ڕاستی فەرموە پێغەمبەری نازدارﷺ (مَنْ كانَ في عَوْنِ عَبْدٍ كانَ اللهُ في عَوْنِهِ) واتە: هەرکەسێك لەیارمەتی بەندەی خودابێ خوداش یارمەتیدەدات هەروەها ڕاستی فەرموە (ما نَقصَتْ صَدَقَةٌ مِنْ مالٍ اَوْ ما نَقص مال مِنْ صَدَقَةٍ) واتە: نە صەدەقەو خێر و نەماڵ وسامان بەبەخشین کەم ناکات.

## ئامۆژگاری

ژنێکی دیندارو دڵسۆزو بەخشندە رووله مێردەکەی دەکات ودەڵی: خۆشەویستەکەم ئەزانی هەر تاوانێك جەستە ئازاربدا و دڵ دەرزێنێ و زۆر پێویستە خۆمانی لێ بپارێزین چونکە ئەبێتە مایەی لە ناو بردنی خۆش حاڵی ژیانی دونیا ... خودا من وتۆ ش بپارێزێ ، نەخۆشیەك هەیە زۆریش کوشندەیە ئەویش تاوان کردنە چونکە ئاسەواری خراپی هەیە لەوانەش وەکو :

١ـ شیرازەی پەیوەندی تێك ئەدا .

٢ـ بیرو باوەڕ لاواز ئەکا .

٣ـ دڵ بۆگەن ئەکا .

٤ـ جەستە دائەتە پێنێ .

٥ـ ڕوخسار ناشرین ئەکا .

٦ـ خۆشەویستی خۆشەویست کەم ئەکا .

٧ـ خۆشەویستی کەس وکار لا ئەبات .

٨ـ چاوی ڕەخنەکاران تیژتر ئەکا .

٩ـ تێ ڕەوانینی سۆز و بەزەیی وێران ئەکا . ...

## خوا ناسی و بەختەوەریی

هەرلەمندالّیەوە لەسەرپاکی پەروەردە کرا ،زۆرجار باوکی دەیگوت دەبێ ببیتە مەلا ،خوێندنی بنەڕەتی تەواو کردو چووە قوتابخانەی ناوەندی ئەوقافی ئاییی، پاشان چووە زانکۆ و کولێژی شەریعە وهەموو قۆناغەکانی بە سەر کەوتویی بڕی ،گەنجێکی دەست ودامێن پاك بوو،خەڵکیش شاهێدیان لەسەر پاکی وچاکی دەدا،هەمیشە خواناس ولەخوا ترس وخۆپارێز بوو کاتێ شەریعەی تەواو کرد ، لەبەر ئەوەی سەر بە هیچ لایەنێك نەبوو بۆیە دایان نەمەزراند ،بۆیە ناچار بوودەستی بە کاسبی کرد،بۆئەوەی یارمەتیەکی ئەو خێزانەی بدات بە بیست ساڵ زێتر بە هەزاری ونەبوونی پەروەردەیان کردبوو،بۆیە ناچار بوولە چاپخانەیەك کە ناسیاوێکی باوکی بوو دەستی بەئیش کردن کرد، پاش ماوەیەك کار ڕۆژێك سەرنجی کتێبێکی دا کە لەژێر دەستیان بوو بۆ چاپکردن،ناوونیشانەکەی زۆر نامۆبوو ،ئەو کوڕەش بڕیاری دابووکەقەت کارێك نەکات کەحەرامی تێدابێ، کاتێك کەهەندێکی لە کتێبەکە خوێندەوە،تەماشای کرد قسەی زۆر ناماقوڵی بۆن کوفری تێدابوو، بۆیە خاوەن چاپخانەکەی لێ ئاگادار کردەوە کە ئەم کارەحەڕامەوپارەکەشی حەرامە،بەلام کابرای خاوەن چاپخانە

گوێی نەدایێ و پاساوی نا حەقی بۆکارەکەی هێنایەوە ،بەلام ئەم گەنجە پێی گوت : یان چاپی ئەم کتێبە ناهەموارە ڕادەگری یانیش ئامادە نیم کار لەو چاپخانەیە دا بکەم ، ناتوانم حەرام بکەم بۆیە ناچار کارەکەی بەجێهێشت ، باوکی لێ ئاگادار کردەوە ،بەلام دەبێ هەمیشە ئەم ئایەتە پیرۆزەمان لەبەرچاو بێ کەدەفەرمووێ

﴿وَمَنْ يَتَّقِي اللهَ يَجْعَلْ لَهُ مَخْرَجا وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لايَحْتَسِبْ﴾

واتە :- هەرکەسێك خۆپارێزبێ لەترسی خودا ی گەورە ئەوا خواش دەروونی رزگار دەکات لە سەرپێچی ئەوەندە رزقی دەداتێ کەخۆشی و حسابی بۆنەکردبێ ، بەڵێ چاپخانەکەی بەجێ هێشت تەنها لەسەر کتێبێکی بێ سەرووبەر و ناهەموار، نەیویست نانەکەی خۆی بەم دووروۆژان پیس بکات ،ماوەیەك بێ دامەزراندن و بێ پیشە مایەوە بەلام کەس لەبەزەیی خوای گەورە بێ ئومێد نابێ تەنها کەسێکی بێ ئاگا نەبێ. زۆری پێنەچوو برادەرێکی باوکی داوای لێکرد کەبچێتە دیداری کۆمپانیایەك بۆ کاری کۆمپیوتەر دیدارەکەی کردو وەك سەرپەرشتیاری دەزگای کۆمپیتەر وەرگیراوە بە موچەو پێشەیەکی زۆرباش، هەروەها زۆر لەجاری پێشتر باشتر و پاکتر و بەرزتر بوو ، زۆری پێنەچوو لەبەر

ڕەوشتی جوانی خۆی ژنێکیان پێشکەش کرد ، پاشان خوای گەورە دەرگای دامەزراندنی لێ کردووە ، وەك مامۆستایەکی مزگەوت وەرگیرا، ئێستاش خاوەن دوومندالەو هەردوو کارەکانی زۆر بەسەرکەوتووی بەڕێوە دەبات، لەخێزانێکی بەختەوەردا دەژین دایك و باوك و خەڵکی دەوروبەری شایەتی بەچاکی بۆدەدەن زۆریش لێی ڕازین،لەهەمان کاتدا مامۆستایەی ئاینی سەرکەوتووە خوای گەورە سەرکەوتووی بکات ، جا دەکرێ گەنجان و دایك و باوکان پەند ئامۆژگاری لەچۆنیەتی پەروەردەکردنیئەم خێزانە وەر بگرن بۆ رۆلەکانیان ولە ژیانی خۆیان بە هەندی وەربگرن لە پرۆسە ی پەروەردە....

## داد پەروەری عومەر

سەردەمی عومەری کوڕی خەتتاب (رضي الله عنه) بەدادگەرترین سەردەمی زێرینی ئیسلامی دادەنرێت،خەڵکی لەسایەی دادپەروەری عومەردا لەو پەڕی ئاسوودەیی و دادگەریدا دەژیان،بەلاّم لەوسەردەمەشدا خەڵکێکی لار ولەوێر وخەتاکار هەرهەبووە،ولێرەو لەوێ توشی لادان بوونە،بەلاّم هەر کاتێك تاوانەکە بەسەریاندا ساغبیایەوە

ئەوە عومەر بێ سێ ودووسزای تاوانەکەیانی دەدان وبەبێ جیاوازی لەنێوان خۆیش ودەروێش،عومەر لەسەر حەق زۆر توند بووابە ڕادەیەك ئەگەر لە خۆشەویستی وچاوی خۆشی بوایە ،بۆیە لەو کاتە کەکچە جولەکەیەك بۆسووك کردنی ناوبانگی عومەر وفەرمانڕەوای ئیسلام گێچەڵی بەکوڕەکەی کرد هەتا زینای لەگەڵ کرد، پاشان زگی بوو،جاجولەکەکان چوونە لای عومەر شکاتیان لە کوڕەکەی کرد،ئەوەبوو عومەر بەبێ سلکردنەوە سزای لە کوڕەکەی دەرکردوتۆڵەی زیناکەی لێ کردەوە جەلدەکاری کرد هەتا کوڕەکەی لەژێرزەبری لێدان مرد،عومەر نەی گوت ئەوە کوڕی منەومن خەلیفەی ئیسلامم وەرن باصولح بکەین و لێی خۆشبین،وەکو ئەم سەردەمەی ئێستای ئێمەکە سزا تەنها لەسەر هەژار وبێ دەسەلاتانە،بۆیە کە کوڕەکەی عومەرتۆڵەی زینای لێ کرایەوە وپێی مرد،پاش ماوەیەك هاتە خەوی عومەری باوکی وپێی گووت:بابە گیان خوا پاداشتت بداتەوە کە حەددت لە من دەرکرد ،بەو حەددە خودای گەورە لێم خۆش بووە،ئێستا وا لەبەهشتی خوا بەشادومانی ڕادەبوویرم ودەسوڕێمەوە.

بەڵێ هەر لە سەردەمی ئەو عومەرە کۆرپەلە منداڵکی تازە لەدایك بووی فڕێدراو دۆزرایەوە، هێنایانە لای عومەر،عومەر نەیگوت لای

بەن ئەمە (بیژییە)با چاوم پێ ی نەکەوێ،بەڵکو گوتی ژنێکم بۆ پەیداکەن بابەخێوی بکاتو گەورەی بکات، کەژنێکیان هێنا،عومەر پێی گووت برۆ ئەم منداڵە بەخێو بکەو چاودێری بکە،هەر کاتێك دیتت ژنێك لێی نزیك بووەو ماچی کرد وبۆنی کرد، هەواڵم بدێ ،ژنەکە بردی ماوەیەك منداڵەکە لای بوو،ڕۆژێك ژنێك هاتە لای منداڵەکە تێر ماچی کردوو بۆنی کرد،ژنەکەش هەواڵەکەی گەیاندە عومەر ،عومەریش گوتی: بڕۆن ئەو ژنەم بۆ بێنن،کاتێك ژنەکەیان هێنا عومەر لێی پرسی بۆچی ئەو منداڵەت ماچ کرد،ژنەکەش زۆر ترساو گوتی :بەخوا هەروا خۆشم ویست حەزم کرد ماچی بکەم ،منداڵێکی زۆر جوان بووهەر لەبەر ئەوە بوو......

عومەریش فەرمووی:نەخێر هەر لەبەر ئەوە نەبووە ڕاستیە کەم پێ بڵێ ژنەکە بەترس و لەرزەوە گوتی بەخوا قوربان دەزانم درۆ دوژمنی خوایە گوتی ئەوەی ڕاستی بێ ئەوە منداڵی منە لەترسان فڕێم داوە؟؟عومەر گوتی :کوا باوکی ؟ژنەکەش گوتی :قوربان باوکی نەماوە؟عومەریش گوتی:چی بە سەر هاتووە بۆم بگێڕەوە!!؟ ژنەکەش گوتی پارەکە پیاوێك بەزۆری پەلاماری دام وزینای پێ کردم لە ئەنجامدا ئەو منداڵەم لەو زینایە بوو، ئەها بەبیرتە گەورەی مەسڵمانان کەپیاوێك کوژراوکەس نەیزانی بۆچی وکێ

کوشتی؟؟؟ عومەر گوتی :بەڵێ...ژنەکەش گوتی : قوربان ئەو پیاوە بوو کەزینای لەگەڵ کردم وئەو منداڵەش لەوە بۆیە منیش بە چەقۆ کوشتم وبکوژەکەش من بووم.

عومەری داد پەروەریش گوتی:دەستت خۆش بێ ئافەرین بەڕاستی تۆ شێرە ژنی،...ئێستاش منداڵەکەت دەبەیەوە ئازادی نایبەیەوە هەر ئازادی.

بەڵێ ئەمەیە فەرمان ڕەوای داد پەروەرو حاکمی قورئان، بڵێ لە تۆڵەسەندنەوەیەکی گەورە هەزاران چاو لەدەر و دامێن پیس دەبنە پیاو، ناموسی خەڵکیش لەم جۆرانە دەحەسێتەوەو، لەشفرۆشی وبێ ئابڕووی باردەکات.

خودای گەورە فەرمان دەکات و دەفەرموێت :وَلَكُمۡ فِي ٱلۡقِصَاصِ حَيَوٰةٞ يَـٰٓأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٧٩﴾

واتە :بەڵێ ئەی هۆشمەندان وخاوەن ژیرەکان لەتۆڵە سەندنەوە بۆتان ژیانی ڕاستە قینە هەیە.

# گه نجێکی دەستپاك

دەگێرنەوە گەنجێکی زۆر رێك وپێك ولەخواترس بوو بەلام بێ کارو نەدار ، زۆرجارلە بێ کاری دەچووە لای پینەدۆزێك دادەنیشت لەگەڵ چەند برادەرێك دۆستایەتی هەبوو هەرجارەی لێیان دە پرسی لە حالی هەر دەیگوت دەقەتێ!!!واتە دەڕوابەرێوە .

رۆژێك پیاوێك لەلایەن کوێخای شارۆچکەیەکی نزیکیان هاتبوو بۆشاری بەدوای کرێکارێکی گەنجی دەستپاکدا دەگەڕا ، کەبچێتە سەرکارەکەی کوێخا ، سەرکاری بۆ بکات، برادەرەکانی بەگەنجەکەیان گوت: ئەم ئیشە بۆتۆ زۆر باشە ! چونکە تۆش بێکاری (گەنجەکە پێیان دەگوت : دەقەتێ)ڕازی بوو بچێتە سەر کارەکە ،چوو بینی کابرای کوێخا سەروەت و سامان دارە بەلام وچاخ کۆرە ! ماوەیەك لە لای مایەوە سەرپەرشتی کارەکانی کوێخای دەکرد هەروەکو کوری خۆی هەرچەندە کوێخا هیچ کوری نەبوو تەنها کچێکی هەبوو کەکوێخا سەیری دەکرد زۆر کورێکی دەستپاك و ژیرو زیرەك ڕەوشت جوان بوو ، لە کارەکانی زۆر سەرکەوتوو دەست پاك بوو ،بۆیەتەماعگیری بوو نەیدەویست لە دەستی دەربچێ بۆیە پێی گوت : کورم من وا پیربومە و هێز وتوانام نەماوە بەرەو فەوتانم

وەرە تۆخۆت سەرپەرشتی قاسەو داهاتوو خەرجی مالەکەم بکە و دەزانم کە تۆ زۆر گەنجێکی دەست پاكو دڵسۆزو داوێن پاکی ،کلیلی قاسەکەشی پێدا ،هەرجارە کورەکە دەگەڕایەوە برادەرەکانی شارهەر چەندە پێیان دەگوت ئیستا چۆنی هە ردەیگوت دەقەتێ!! بەبێ ئەوەی هیچ نهێنیەکانی ماڵی کوێخا ئاشکرا بکات ، لەکارەکانی زۆردلسۆزبوو، بەردەوامبوو،تا وای لێهات کوێخا نەخۆش کەوت !رۆژێك بانگی ئەوکورەی کردو وتی:-کورم من ڕەنگە بمرم !! لەپاش خۆم کەس شك نابەم بۆیە حەزدەکەم کچەکەم بە خۆم بە شو بدەم بۆئەوەی لە پاش من بەتەنیایی نەمێنێتەوە ! وکەسیش لە تۆباشتر وشایان تر نیە کە پێشکەشی بکەم ،بۆیە حەزدەکەم کچە بەنازو نازدارەکەم پێشکەشی تۆبکەم هەر شایانی خۆتە :
هەروەها ماڵ و سامانەکەش هەربۆخۆتان بێ با نەکەوێتە ژێر دەستی خەڵك کوڕەکەش ڕازی بوومارەی کچەکەی کرد وگواستیەوە ،بەیەك جاری بوو بەکوری ڕاستە قینەو خاوەن مالەکە،بەبێ ئەوەی لوت بەرز بێ هەرجارێك دەچووەوە سەردانی ماڵەباوان و برادەرەکانی هەر دە یگوت دە قەتێ !!
وای لێهات خەزوریشی کۆچی دوای کردماڵ وسامان و کوێخایەتی بۆمایەوە لە خزمە تکاری بوبە خاوەن ژن وماڵ و سامانەکەی

پەراسپاردەی کێخواکە بووە جێگرەوەی کوێخایەتی خەزوری !!
رۆژێك هاورێکانی گوتیان :ئەرێ با سەرێك لە دەقەتێ بدە ین !!!
هەردەڵێ: دەقەتێ بزانین چۆن دەقەتێنێ!!! رۆیشتن چوون بۆسەردانی دەقەتێ.....
کەگەیشتینەماڵیان زۆربە گەرمی وبە رێزەوە پێشوازی لێکردن و میوانداریەکی جوانی کردن، بینیان وا (دەقەتێ )ژنی هێناوە بۆتە جێنشینی کوێخا وکوێخا مردووە پاشان سەرەخۆشیان لێکردوو گوتیان ئێستا تەندروستی وبارودۆخت چۆنە ؟؟
ئەوپیاوە هەم دیسان وەك جاران دووبارە هەر دەیوت :سوپاس بۆخوا هەر دەقە تێ...
سالآن هاتن و تێدە پەرین زۆر بەبەختەوەری دەژیان لە گەڵ خێزانەکەیدا ،پیروخەرۆ بوون، بێگومان وەکو هەمووما‌ن رێگای مردنمان لەپێشە ،ئەو پیاوەش کۆچی دوای کرد ،هاورێکانی بەمەیان زانی و چونە سەر گۆرەکەی ،پینە دۆزی کۆنە برادەری لە سەرگۆرەکەی وەستاوگوتی...زۆر جاران هەر دەتگوت دەقەتێ.... !!
ئەی ئێستا لەناو گۆر چۆن دەقەتێ؟هەر خۆی گوتی: بەخوا ئەگەر دنیاش بقەتێ ناوگۆر بەبێ کردەوەی چاکەو بە هەومنتە ناقەتێ، هەزاران رەحمەت لەگۆرتبێ.....

## دووژنی

مامۆستایەکی برادەرم بۆی گێڕامەوە گوتی :دراوسێیە کمان هەیە دووژنی هەیە ، ئەو دراوسێیە ژنی یەکەمی ژنێکی زۆر ڕێك و پێك و بالآبەرزە ، کۆمەلێك مندالّی جوانی هەیە ،ئەم خێزانە لەهیچ شتێکیان کەم نەبوو ،بەلام هەرکەخوا نانێکی دایە ئەم پیاوە پارەی زۆر بوو ژنێکی تری بەسەر ژنی یەکەمی هێنا ،هەرچەندە ژنی یەکەمی زۆر جوانترە لەژنەکەی دووەمی بەلآم ژنەگەورەکەی بەمندالّەوە لە نهۆمی دووەم داناوە بەتەواوی فەرامۆشی کردوە لەبەر ژنە تازەکەی!!!

﴿بەڕاستی نا دادپەروەری ئاوا دەبێ ﴾؟؟ ئەو برادەرەم وتی رۆژێك تازە ئۆتۆمبیلێکم کڕی بوو درەنگی شەوبوو خۆم وخێزانەکەم لەشەو گەڕان و پیاسە دەگەڕاینەوە مالّ، ژنە گەورەکەی دراوسێشمان لەبەر دەرگابەخەمباری ڕاوەستابوو هەرچەندە شەویش درەنگ بوو ،

دەلّێ قسەیەکی وای کرد خەریك بوجەرگم بۆی بسوتێ، دەلّێ ژنەکەگوتی مێردەکەی منیش هەموو شەوێ دەستی خانمەکەی دەگرێودەچێتە پیاسەو گەران حیساب بۆفەقیری وەکو منیش ناکات (سندان لەفەقیر بدات)فەقیرهەر بۆمردن باشە........هتد

دەڵێ کەوای گوت. زۆردڵم پێی سوتاو تەواولەناخی پڕئاگری گەیشتم،گوتم دەی دەی خوداکەریمە انشاالله خوا هەموشتێك چاك دەکات وبەدڵی تۆش دەبێ، خۆم بەحەوشەی خۆماندا کردو فرمام وهیچ قسەی ترم پێنەکرا ،زۆر شەرمەزار بووم لەبێعەدالەتی ئەوکابرایە بێ ویژدانە پیاوەکەم لەپێش چاوکەوت ونەفرەتم لەناعدالەتی کرد.ئێمەش بەوجۆرەپیوانە دەڵێین کاکی برا تۆچۆن نەفس وئارەزووت هەیەو ژنەکەشت هەروەکو تۆیە ،بێجگە لەتۆ کەسی ترهەیە حەزەکانی جێ بەجێ بکات؟!! تۆتەنها دورێگات لەپێشە یان ئەوەتە دەستی لێبکەیتەوە مادەم ناتوانی ونازانی دووژن بەرێوەببەی ،یانیش بەیەکسانی وبەیەك چاو سەیریان بکەی وهەڵسوکەت یەکسان بێ لەنۆرەو ژیانی رۆژانەدا، سەرجێیداو دەنا بەخوا لەدنیا دەدۆڕێنی هەروەها لەقیامەتیش بەستەم کارو بەلاخواری حەشردەکرێی ،خواش لێت نابورێ ئەگەربەزوترین کات تەوبە نەکەیت و پەشیما نەبیەوە ،ویەکسانی لەبەرامبەر ژنەکانتدا نەکەی .

# صەدەقە و نەخۆشی

مامۆستایەك دەربارەی ژیانی پڕلەچەرمەسەری خۆیو خێزانەكەی دەگێڕێتەوەو دەڵێت:لەو كاتەی كە خێزانەكەم خواست تەندروستی زۆر باش بوو هیچ نەخۆشیەكی پێوە دیار نەبوو،چەند ساڵێك بەخۆشی وبەختەوەری راما ن بوارد، لەپڕێك تەندروستی خێزانەكەم تێك چوو، لەهەمان كاتیشدا لەكەیەكی ڕەش لەسەر سنگی پەیدابوو، كە سەردانی پزیشكمان كرد، گوتی:ئەم نەخۆشییە زۆر دەگمەنە و ڕەنگەلەملیۆنێك كەس تەنها یەك كەس توشبێ،ناوی(سكلریۆدیرامایە)ئەم نەخۆشیە هەتا ئێستا چارەسەری نیە بەلاَم جاروباریش بووە خۆی لەخۆوە چاك بۆتەوە،هیچ دەرمانێكیش شك نابەم بۆی بنوسم، ئەو قسەی دكتۆر بەڕاستی زۆر سەخت بووبۆمان بەتایبەت بۆخێزانەكەم وەكوهەورە تریشقەیەك بوو كەبەسەریدا بكەوێت ،بۆیە كەوتە شین وگریان وبێ ئومێد بوون، بەلاَم من زۆر دڵم دایەوە گوایە شیفا بەدەست خوایە وخودا هیچ دەردێكی بێ دەرمانی نەناردوە، ئەگەر ئەمڕۆش چارەسەری نەبێ هەرچارەسەری دەدۆزرێتەوە خواكەریمە بەلاَم قسەی ئەو دكتۆرە زۆرلەو قسانەی من كاریگەرتربوو، چونكە ئەو دكتۆرە گوایە هەمووشتێك دەزانێ بەلاَم هەرناوەناوە سەردانی

باشترین دکتۆرمان دەکرد بەڵکو ئەوە خوایە شیفایەکی بۆهات بێ ،
یانیش دەرمانێکی تازە پەیدابووبێ یانیش دکتۆرێکی شارەزاتر
دەرمانێك شك ببا سەرتان نەیێشینم زۆر ئەولاو ئەولا لەنۆژدارو
پزیشکان گەڕاین، هەر هەمان قەوانیان لێ دەدایەوە هیچ
ترووسکیەك بە دی نەدەکرا بەڵام لەهەمان کاتدا هەندێك دەرمانی
بەکار دەهێنا وەك هێمن کەرەوە،بەڵام من خۆم لەڕەحمی خوا قەت
بێئومێد نەدەبوم چونکە لەمێژبوو ئەو فەرمودەی پێغەمبەری
ﷺ نۆژدارم لەبەربوو کەدەفەرموێ:(خۆتان چارەسەربکەن چونکە
خودا هیچ دەردێکی بێ دەرمان دانەناوە)من و هاوسەرەکەم
زۆرئاراممان گرتو زۆرشەو ڕۆژگاری پڕلە ئازارو ناڵەو بێزاریمان
بەڕێکرد ،نەخۆشەکەش هەتا دەهات نەخۆشیەکەی زێتر پشتی
لێدەستاند هەتا وای لێهات وەکو داری بێ ئاو وشك و لاوازتر
دەبوو، زۆرجار دەیگوت دەزانم من چاك نابمەوە خەریك دەبوو
ورەی بەربدات ، بەڵام من زۆر دڵم دەدایەوە هەر دەمگوت:خوا تۆی
زۆر خۆشدەوێ بۆیە تۆی بەسەر کردۆتەوە دوای هەموو هەورازێك
نشێوی دێت و من لەگەڵتدام و پشتت لێ ناکەم هەربزانە
چارەسەریت هات هەرڕۆژە دەرمانی تازە دەدۆزرێتەوە لەهەر
جێگایەك شکمان برد هەبوو بەدوای دادەچین خەم مەخۆ خوا

کەسێك تاقی دەکاتەوە کە خۆشی بووێ ئەگەر نا لەوجیهانە خوا لەش ساغ و جوانت دەکاتەوە ، هەروەها بەبەهەشتی خۆی شادت دەکات ، ئازاری ئەم دونیایە هەرچەندە زۆربێت ناگاتە کەمێکی دۆزەخ بەلێ بەم قسانە دڵم دەدایەوە و فەرامۆشی دەهات تاوای لێهات توشی کەم خوێنی بوو هەموو مانگێك دەبا خوێن وەربگرین بەڵام دوای چەند ساڵ چارە سەری کەم خوێنیەکەی کرا ، ڕۆژێك باسی کەلەشاخم بەگوێی داچرپاند گوتم: پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمویّ لەو شەوەی کەشەو ڕەویم پێکرا بە هەرئاسمانێك ڕەت دەبووم هەر هەموو فریشتەکان پێیان دەفەرمووم:( يا مُحَمَّد مرً أمَتِكَ بِالحِجامَةَ) واتە ئەی محمد ﷺ بەنەتەوەکەت فەرمان بکە کەلەشاخ بگرن و حیجامە بکەن  هەروەها گوتم پێغەمبەری نۆژدار فەرموویەتی: (خَيرُ ما تَداوَيْتم بهِ الحِجامة) واتە چاکترین چارەسەرکە کردبتان حیجامەیە ، بۆیە لە ١٧ی مانگی قەمەریدا حیجامەیەکمان کرد دوای ئەوەپێم گوت پێغەمبەر(ﷺ): فەرموویەتی:(داووا مرضاكم  بالصدقات)واتە: نەخۆشەکانتان بەخێر و صەدەقە چارەسەر بکەن ،هەروەها(الصَدَقَةُ تَدْفعُ البَلاءْ وَتَزيدُ في العُمرْ) (واتە خێر و صەدەقە کردن نەخۆشی و بەڵا لادەبات تەمەنیش درێژدەکات ، بۆیە پێمگوت باشترین چارەسەری

تۆ خێر و صەدەقە کردنە بۆیە یەکسەر قەصابێکمان راسپارد کەوا ئاژەڵێکمان بۆ بکڕێ بەنیازی نەخۆشیکە سەری ببڕێ ، ئەمەش لەیەکەم رۆژی ڕەمەزانی پیرۆز بوو ئێستا ڕۆژبەڕۆژ پاش ئەم سەدەقەیە ئەم نەخۆشە بەرە بەرە دەبوژێتەوە وئازاری نامێنێ وبەرەو چاك بونەوە دەچێت(تاکو نوسینی ئەم بەسەرهاتە) والحَمْدُ للهِ رَبِ الْعالمَين دوای ئازارو شەکەتیەکی دورو درێژ..

# گەنجێکی لەخوا ترس

دەگێڕنەوە لەمزگەوتێکی شاری دیمەشقدا مامۆستایەکی زۆر زاناو کۆمەلایەتی هەبوو خەڵکی زۆر خۆشیان دەویست وەك قازیەك هەمیشە لەخەمی خەڵکی وچارەسەری گرفتەکانایان دەکرد، هەربڕیارێکی بدابا خەڵکەکە بێ سێ دوو پێی ڕازی دەبوون بەڕادەیەك زۆر جار ژنی بۆگەنجان دەخواست و ژنانی بەشوودەدا، بەکورتی هەرچی مامۆستا بیگوتیا کەس نەی دەگوت لەل، ئەو مامۆستایە چەند فەقێیەکی هەبوو لەمزگەوتەکەی دمیان خوێند لەناو ئەوفەقێیانەش فەقێیەکی زۆرزیرەك و ژیرو لەخوا ترس و بەلأم چەندی بلێی ی نەدارو دەست کورت بوو، لەسەر ئەوەش هەمیشە بەرچاو تێربوو وچاوی لەحەرام نەبوو و دەستی بۆکەس پان نەدەکردەوە وەگلەیی حاڵی خۆی بۆکەس نەدەکرد، جگە لە خوا ئەوگەنجە لەناو مزگەوتەکە دەخەوت وهەرلەوێش دەیخوێند، لەدەرەوەی دیمەشق بۆفەقێیاتی هاتبوو، بەردەوام گیرفانی بەتاڵ بوو "رۆژانە فەقێکان بۆراتبە ماڵ" بەماڵ دگەڕان بۆخواردن ، بەلأم وەکو گوتمان ئەو گەنجە چاو لەدەستان نەبوو خۆی بۆخواردن نەدەگەڕاو تەنها ئەگەر برادەرەکانی بچووبان شتێکییان

دەست بکەوتایە پێکەوە دەیان خوارد،قەدەری خوا چەندرۆژێك فەقێکان چووبونەوە ماڵی خۆیان ، وەئەم گەنجەش بەتەنها مابۆووە چەند رۆژێك ئەم گەنجە بەرۆژوودەبوو بەبێ خواردن دە مایەوە تابرسیەتی تەنگی پێ هەڵچنی وە شەکەتی کرد، وای لێهات جولەی لێبڕا .بەلاَم لەترس و شەرمی خوا ڕووی لەکەس نەنا ،هەروا بەبرسیەتی مایەوە ،بەلاَم بیری کەوتەوە کەلە ئیسلام دا ئەگەرکەسێك ناچاربێ وەبزانێ لەبرسان دەمرێت دەتوانێ کەمێك گۆشتی بەراز بخوات لەبەرئەوە گووتی واچاکە بچم لەماڵێك لەومالانە بەناچاری شتێك بخۆمو تاکو خوا دەرگایەکم لێ دەکاتەوە، مزگەوتەکەش لەناومالان بوو "

وبانەکانی ماڵەکان لەگەڵ مزگەوتەکە لەسەریەك بوو .فەقێ بەلاکەلاك بەسەر پەیژەی مزگەوتەکە ،سەرکەوت تاکو بەسەربانىدا بچێتە مالێك وخواردنیك دەست بخات تاکو نەمرێت، هەروەها بەسەربانەکاندا تێپەڕی بینی مالێك هیچ هەستی تێدانیە وەکەس لەوماڵە دیار نەبوو، بۆنی شیوەکی زۆرخۆش دێ ،فەقێش لەپەیژەکان چووە خوارەوە" "سەیری کرد کەس لەوماڵە نەبوو ،چاووی بەمەنجەڵێك شیوی تازە کولاو کەوت و لە برسان تاوی دایێ وسەرەکەی هەلگرتو چی بینی ؟ بینی وا مەحشی تێدایە هەڵمی

بەری ئاسمانی گرتیە و بۆنی پیاو شێت دەکات .یەکسەر مەحشیەکی هەلگرت و خستیە ناو زاری بەلاّم ئەوەندە گەرم بوو دەمی سوتا ،فرێی دایەوە یەکسەر دۆزەخ و گەرمی وسزای تاوان ودزیی بیرکەوتەوە بەخۆی گوت:_ فەقێی نامەرد تۆوات لێهات بچیتە مالآن و دزی بکەیت خوات لەبیرت بچێ لەناچاری!؟ لەوخەیالآنەدابوو بەلاکەلاك گەڕاوە مالّەکەو مەنجەلّەکەی بەجێهێشت ، بەبرسیەتی و ناچاری گەڕاوە ناومزگەوتەکە، پشت بەخوا لەژوورەکەی دانیشت وکەسیش بەحالّی نەدەزانی مەگەر خوا "

کاتێك بینی ژنێك لەدەرگای مزگەوتەکەڕاوەستاوە"داوای مامۆستای مزگەوتی کرد . مامۆستاکەش لەوێ بەدەنگیەوە چوو چەند قسیە یەکیان کرد بەلام فەقێ نەیزانی باسەکە چیە ؟

مامۆستا بانگی کردوو گوتی هۆ فەقێ ژنت دەوێ ؟ فەقێش والەبرسان حالّی خۆی نییە ؟ وتی جا مامۆستا من فەقێیەکی بێکەس و بیٚ مالّ و نەدارم کێ پێم ڕازییە ؟چۆن ژنم پێدێ!!!

مامۆستاکەش گوتی فەقێ هیچی ناوێ بەس تۆڕازیبە هەموو شت ئامادەیە فەقێش وتی قوربان لەقسەت دەرناچم !!!!

چی دەفەرمووی با وابێت ... مامۆستاش بەژنەکەی گوت فەرموو وەرە دانیشە ژنەکەش بە پێچەو نیقاب و ڕێکو پێك، روخسارو دەم و چاوی دیارنەبوو ، هات دانیشتن ،مامۆستاکە گوتی: بە فەقێ رازی؟ گوتی بەڵێ "یەکسەر لەفەقێی مارەکرد !! گوتی:کورم ئێستاش حەلالی یەکترن فە قێ دەتوانی بچێتە ماڵ خێزانی خۆت مالی سەربەخۆت هەبێ لە چی کەم نییە !!فە قێیش بە گەلی کەوت "پیرۆزی یەکتری بوون """""ژنەکەو فەقێ رۆیشتن : کاتێك گەیشتنە بەردەرگایەکە کردیەوە فەقێ بینی هەمان!! ماڵبوو کە ئەو چووبوو بۆ خۆاردنێك لێی دەگەرا ، جا کاتێك چوونە ژوورەووە دانیشت ژنەکەی پێی وت چیت پێویستە؟ فەقێش وتی زۆر برسیمە..... !!

کەس نازانێ کەرزق لەکام لایە وچۆن دێ ،ژنەکە یەکسەر چوو یەك مەنجەڵی مەحشی هێناو لەبەردەمی فەقێی دانا!!فەقێ دەستی کرت بەگریان !!! ژنەکە لێی پرسی ئەوە بۆدەگری ؟ فەقیش حاڵیی خۆی و بەسەرهاتەکەی بۆگێرایەوە ژنەکەش تەمەشایی کرد راستە ،تەنها مەحشییەکی تێدانەما بوو ؟ گوتی بەخوا ڕاستە ئەوەتە مەحشییە کەی تۆ کە نەتخواردوە . ئەوجا فەقێ تازگی هێشا خواردی ! وەژنەکەش پەچە کەی هەڵداوەو

نەگەی نەخۆی هەر تەمەشایی بکەی گوتی: من ژنی بازرگانێکی گەورەو پارەدار بووم ، لەگەل پیرەمامێکم رووما لەم شارە کردووە، ئێستاش خوای گەورە من ومالەکەمی بەقسمەت تۆ کردووە ، نۆشی گیان و پیرۆزت بێت .

## قەرەبوی خوا

لەسەردەمی پێغەمبەری پێشەوامان ﷺ لەشاری مەدینە دا پیاوەکی زۆر هەژارو نەدار هەبوو ، بێ مال و زوگرتی بوو ، زۆر بێنەوابوو زگێکی برسی وزگێکی تێر بوو ،بۆیەشەوێك برسێتی تە نگی زۆری پێ هەلچنی ،ناچار بوو بچێتە دزی، تاکو زگە هارە برسیەکەی تێر بکات دەرپەڕی و ئەوکۆلان وئەو کۆلان لەمالێك دەگەڕا کەکەسی لێ نەبێ و دزیەکەی لێ بکاو لێی ئاشکرا نەبێ وکەسیش نەیبینێ ، بۆیە زۆرچاوی گێڕا هەتا مالێکی بێوەژنی چۆلی بەدی کرد ، خواخوای بوو کەسی لێنەبێ ،بۆیە وەکو هارلەبرسان خۆی بەژوور داکرد ،چاوی گێڕا خواردنێکی چەوری بەدی کرد بەلام یەك سەر گەورەی وسزای خوا ، هەروەها ئامۆژگاریەکانی پێغەمبەری نازداری ﷺ بیرکەوتەوە کە فەرموویەتی هەرکەسێك واز لە حەرامێك

بهێنێ ئیلا خوا به چاکتر بۆی قەرەبوو دەکاتەوە و پاداشتی دەداتەوە ، بۆیە پەشیمان بوەوە دەستی بۆخواردنەکە نەبرد ، پاشان چاوی گێرا دیتی وا کۆمەڵە زێرێکیش لەولاوە دانراوە ،دیسان گوتی بەڵێنی پێغەمبەرە، کە ئەگەرنەی دزم خودا قەرەبووی چاکترم بۆ دەکاتەوە ،لەولاوەش دیتی واژنێکی تەنهاو نازداریش بەتاقی تەنها کەوتۆتە خەوێوتەنهایە لەوماڵەدا و بێجگە لەخوا کەس بێدار نیە ،بەڵام پیاوەتی وغیرەتی جولاً هەمان فەرموودەی پێغەمبەری چاوساغی ﷺ بیرکەتەوە یەك سەر دەرپەرپە دەرەوە لەدڵی خۆی دا گوتی: خوا ئاگادارەو بەرەحمەو ناخەوێ پاداشتم تەنها لەو دەوێ ،بەبرسێتی وکەساسی گەڕایەوە ماڵەوە پشت بەخوا بەیانی چووەمزگەوتی نازدار بینی وا ژنان لەپشتەوەی پیاوان نوێژیان دەکرد ،دوای نوێژ ئەنجام درا پێغەمبەری خوا ﷺ رووی وەرگێڕاو لەحاڵ وباری هاوەڵانی دەپرسی ،لەو کاتە دا ژنێك گوتی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم شەو دزهاتۆتە ماڵەکەم بەڵام هیچی نەبردوە ،پێغەمبەری بەحیکمەت وخەم خۆرﷺ فەرموی :دەی ئەوجاچیت دەوێ؟ گوتی قوربان من بێوەژنم وبەتەنهام چیدی ناوێرم بچمەوە ماڵەکەم ،دەترسم پێغەمبەر ﷺرووی کردە هەمان ئەم پیاوەی کەچووبووە

ماڵەکەی پێی فەرمووەهاپیاو تۆ خێزانت هەیە؟پیاوەدزەکە زۆرترسا بەشەرمەوە هەستایەوەوبەترسەوە گوتی نەخێر قوربان بێماڵ وحاڵم ،فەرموی ئەو ژنەت دەوێ ؟ پیاوەکەش لەترس و شەرمەوە لێوی دەلەرزی لەهەمان کاتدا زمانی لەنگ بوو لەخۆشیان دەمی لیکی دەکردیەك سەرگوتی:بە....بە...بەڵێ قوربان ئەوجا پێغەمبەر ی خاوەن نیگا (ﷺ) رووی کردە بێوەژنەکەو پێی گوت فەرمووبریاربدە خوا بۆهەمووکەسێك حەڵاڵی کردوە کەوا هاوسەرگیری بکات تۆش مافی خۆتە تۆ ڕازی شو بەو پیاوە بێ ژنە هەژارە بکەی ؟ گوتی قوربان هەرچی تۆ فەرمان بکەی من پێی ڕازیم ، بەو جۆرە هەر لەو بەرە بەیانیە زووە هەردوکیان لێك مارەکران وپیاوی هەژارو ڕەبەنیش بووە خاوەنی ژنەکەو هەموو ماڵ و زێڕەکەش کەلە ترسی خودا لەو شەوە دەستی بۆنەبردبوو، بەم جۆرە دەستی ژنەکەی گرت و چونەوە ماڵی بووکی دەوڵەمەند و تازە ، بەڵێ ڕاستی فەرمووە پێغەمبەر ﷺ هەرکەسێك واز لە حەرامێك بهێنێ ئیلاخودا بەچاکتربۆی قەرەبوو دەکاتەوە، پاداشتی حەڵاڵی دەداتەوە هەرەوە ها خودای گەورە دەفەرموێ:﴿وَمَنْ يَتَّقِي اللهَ يَجْعَل لَهُ مَخْرَجاً وَ يَرْزُقَهُ مِنْ حَيْثُ لا يَحْتَسِبْ﴾

## کەخۆشەویستی دەکوژرێ

کە لەدەرگای ماڵەکەیان دا بۆداخوازی کچەکە زۆر بەشەرم وشکۆوە دەرگایی لێ کردنەوە ، فەرمووی لێ کردن ودانیشتن ،زۆرسوپاسیان کرد لەسەر گەرم وگوری بەخێرهێنان وێزگرتنیان ،کورەکە پێشتر بەدیقەت سەرنجی دابوو هەرلەگەڵ یەکەم چاوپێکەوتن شەیدای ببوو!بۆیە بە خۆشی باسی داخوازیو هاوسەرگیری لەگەڵدا کردەووە،کچەکەش یەکسەر ڕازی بوو هەرچەند کۆسپ و لەپێشیان هەبوون بەلاَم خوا بە قسمەتی یەکتری کردن ،مانگ بەمانگ خۆشەویستیەکەیان پەرەی دەسەند گەرموگورتر دەبوو ،دووری رۆژێکی پێ بەساڵێك هەبوو:- هەردەیگوت داخوا کەی بێ خۆشەویستەکەم ماڵەکەم بۆرووناك بکاتەوە لەتەنهای ونامۆی رزگام بکات !!

ئەورۆژەکە هات کەهەردووکیان بەپەرۆشەوە لەمێژ بوو چاوەڕێی یەکتریان دەکرد کە زەماوەندەکە نزیك بۆوە دایکەکە ڕێنمای کچەکەی کرد پێی یگوت :ئامۆژگاریت دەکەم کچەکەم بۆی دڵسۆزبە هەروەکو من بۆت دڵسۆز بووم "ئەویش بۆت دەبێتە کۆیلەت ، بۆی ببە بەخاك ئەویش بۆت دەبێتە ئاسمان وئاگات لە ماڵ و ئابڕوی بێ وپێداویستە کانی بەجێبێنە نەکەی، شتە شاراوەکانی

لای منیش باس بکەی و قەت نەکەی برسی بکەی !!! کچەکە هەر دەیگوت: بەڵێ دایە گیان ....بەسەرچاو"

ئەوخۆشەویستمەومێردوهاوڕێوهاوخەموهاوژینمە،گوازرایەوەو چووە ناو قەفەس ،بەڵکو لانەیبەختەوەری و لەخۆشەویستی نموونەیان کەم بوو"  هیچ کاتێ بێ یەکتری نەدەحەوانەوە ،ژنەکەی وەك منداڵێك هۆگری ببوو ،بەڵام قەدەری خوا بوو مێردەکەی چەند مانگێك چوو بۆهەندەران ،ژنەکە ئارامی لێ بڕا نەیتوانی ئەم دابڕانە هەڵبگرێ ،بۆیە بەدوای داچوو ،بەیەکتری شاد بوونەوە ،چەند ساڵێك تێپەری خوای گەورە منداڵێکی پێ بەخشین لەدووری ماڵە باب وخێزانیشیان تەواو نیگەران ببوون ، زۆر پیاوەکەکە دەیگوت:خۆشەویستەکەم تۆهێندە دڵسۆزو خۆشەویستی لام جێگەی هەموو کەس و کارو خۆشەویستانمت گرتۆتەوە ،ئەگەر تۆم هە بێ ئەوا هەموو دونیا بەهی خۆم دەزانم ، تۆدایك و باوك و کەس و کارمی خوا خێرت بنووسێ ،سالان تێپەری و ژنە کەهەر خەریکی ماڵ و منداڵ و خزمەتی مێردەکە بێ بێزاری و شەکە تی دە کرد ،پیاوەکەش تادەهات لە کارەکانی زیاتر سەرکەوتوودەبوو ،وەك دەڵێن لەدوای هەموو مێردێکی سەر کەوتوو ،ژنێکی سەرکەوتوو هەیە ،زۆربەختەوەر دەژیان،لە هیچیان

کەم نەبوو شایان بەسەپان نەدەزانی بەلام شەیتان وئافرەتی خراپ نەخەوت بوون، پیاوەکە وای لێهات سەرقاڵ ببوو زۆرجار نەدەهاتەوە یا درەنگ دەهاتەوە ،ژنە وەفادارو وپەرۆشەکەش هەروا لەچاوەڕوانی دەمایەوە ،ناچار پەیوەندی پێوە دەکرد ،پیاوەکەش دەیوت ژنەکە زۆر سەرقاڵم بەکارەکانم دەرفەتم بدە ...ژنەکەش دەیوت:-خوا بتپارێزێت ، هەروەها چاوەڕێت دەکەم وای لێهات ژەنەکە زۆر بێزار دەبوو لەچاوەڕوانی مێردەکەی ،زۆر شەیدایانە چاوەڕێی دەکرد ،بەلام بێ هوودە دەمایەوە زۆر جاریش خەوکوتکە دەیبردەووە، لە شەوانی درێژ چاوەڕوانی دەکرد و هەرنەدەهاتەوە، ناچار ژنەکە وردە گلەی دەکردە و دەیوت ئێمە گییانێکین لەدوو جەستەدا و بێ تۆ هەڵ ناکەم فریام کەوە تۆمنی منیش تۆم بەلام ئەم قسانە بێ سوود بوو !!

تاوای لێهات ژنەکە کەوتە گومانەوە لێی کەسەیری مۆبایلەکەی دەکرد شتی نامۆی دەبینی؟ نەیی دەزانی چ بکا ؟

چەندان کورتەنامەی ئافرەتان و قسەی رۆمانسی وێنە ی ژنان و زۆر شت لەم بابەتانەوە تا وای لێهات مێردەکەی فەرامۆشی کردبۆیەزۆر پێی دەوت کەتۆخۆشەویستی یەکەم و کۆتایی ،بەلام

مێردەکەی ئەوهەرخەریکی فەیس بووكو ئەنتەرنێت وکەوتبووە
داوی دڵداری  لەگەڵ ژنان دا :-
ژنە داماوەکە هەر ئەوەی پێ مابوو،کەیادەوەریەکانی بیر بخاتەوە
ئاخر مێردە خۆشەویستەکەم ئەی تۆ نەت گوت ....تامردن یەکتری
مان خۆش دەوێ هەرگیز بەجێتنایەڵم !!
پەیمانی خۆت لەبیر چوو؟؟کەهەمیشە رێزم بگری !! نەدەووت بێ
دڵی من نەکەی ::!!!قوربانی یەکتری بین ؟
مێردەکەش زۆربەساردی وەلامی دایەوەو دەیگوت ئاخر منیش ئارە
زووم هەیە پێویستم بە دۆستایەتی ژنی نازدارو ناوقەد  باریك و
قژزێرِینوچاوگەش وجوان هەیە،دونیا گۆڕاوە منیش ئارەزووم
لەیەکتر ناسین وقسەی خۆشو پێکەنین هەیە دونیا دونیای
ئەنتەرنێتە و پەیوەندیە کۆمەلایەتیەکان ناچارم دەکات، پاش
ماندووبون و شەکەتیەکی زۆر هەوڵدانی ژنەکە بێ سوود بوو !!!!!
ژنەکە گوتی کەوایە دەستبەردارم ببە، باهەرکەسەمان بچێت
بۆرێگای خۆی زیاتر بەرگەی ئەم حاڵە  ناگرم لێرەدا شەیتان
تیختیەی دەدا ، ژنەکە هاتەوە سەرخۆی نەفرەتی لەشە یتان کردو
بەئازارو گریان و چووە ژوورەکەی خۆی ودەستی کرد بەلە باوەش

نانی جل بەرگی  مێردەكەی و بۆن كردنیان ،بەگریان و فیغان ،پیاوەكەش هاتەوە سەر خۆی كەوتە بیركردنەوە ::.!

ئاخر ماقولە من ژنێكی وا بەوەفام هەبێ!! بیكەم بە قوربانی ئارە زووەكانی خۆم !! چۆن ئەو ژنە بكەمە قوربانی كەسانێكی ناپاك؟ چۆن ئافرەتێك برسی بكەم لەكاتیك دا لەرۆژانی برسیەتی دا منی تێر كردووە !!چۆن ژنێك بەرەلابكەم ؟ئاخر كەم دەریاو زەریای بڕیوە ،بەدوای خۆشەویستیەكەی خۆیدا هاتووە چۆن پاكیەك لەبیر كەم كەسەرەرای ئەوهەمووناپاكیانەی من هێشتا هەربۆم دەسوتێ،چۆن بتوانم ئەوهەموو بەختەوەرییە بكەمەناو سەللەكەوە؟؟ فرێی دەمە زبلدانەوە :چۆن بتوانم لەبەرامبەر كەس و كارەكە ی خۆم وئەو چاوهەلبێنم ؟ چۆن؟ و چۆن و ؟چۆن؟ نانا خۆشەویستەكەم ناتوانم پشتت تێبكەم ،ناتوانم بێ وەفابم ، ناتوانم تۆفەرامۆش بكەم بە قوربانی ئارەزوو مەرامەكانی خۆمت ناكەم !ناكرێ!ناكرێ!گوناحە !یەكسەربەپەلە خۆی بەژووری ژنەكەدا كردوگوتی : خۆشەویستەكەم پەشیمانم هاتم بمبوورە وەرم بگرەوە هەرتۆخۆشەویستی سەرەتاو كۆتای منی::: من كردم تۆنەیكەی بێ تۆژیان ئەستەمەو ناقەتێ و بێ تۆ ،وەلام بدەوە بمبورە هاتمەوە

سەرخۆم ئێستا تێگەیشتم وەلامم دەوە من کردم تۆنەیکەی ،تەنها تۆکەسی منی بەهەموو دنیات نادەم....!

بەلام چی دیت هەرئەوەندەی دیت جە ستەیەکی ساردوو سڕو گیانی ژنەکەی دەرچوو بوو.....!!!!مالئاوای یەکجاری لێکردبوو ڕوخسارێکی خەماوی و زەرد لەسیمای دەخوێندرایەوە: ،مێردەکەم هەرتۆم خۆشویستوەو هەرتۆم خۆش دەویٚ هەرچیشت کرد تاهەمیشە هەرخۆشەویستی منی ،تاهەمیشە لە سەرپەیمانی جارانم وخۆشم دەویٚ ی خۆشمدەویێ.....!!!

## دا پۆشینی نهێنی خەلك

دەگێڕنەوە لەگوندێکی کوردەواری خۆمان ژن ومێردێك لە خێزانێکی بەختەوەردا دەژیان، مێردەکە پیاوێکی سادەو ساکار و نەداربوو،ژنەکەش ڕێك و پێك و بەرچاو بوو ،کابرایەکی نەفس نزم لەوگوندەدەژیا زۆر حەسوودی بەو ژنە دەبردو چاوی برسی تیٚ بڕی بوو ،بۆیە دەیویست ناکۆکی و درز بخاتە نێوان ئەم دوو ژن ومێردە بۆیەهەمیشە بیری دەکردووە فێلێکیان لیٚ بکات و لێکییان بکات بۆیە زۆر بیری لەوە دەکردوە هەندێك پارەی هەبوو

بۆیە کاتی وەرزی حەج داهات چووە بن گوێی پیاوە ساویلەکە و پێی گوت :بۆناچیتە حەج ؟؟

ئەویش وتی کاکە من پیاوەکی هەژارم توانای حەجم نیە خواخوامە خێزانەکەم پێ بەخێو بکرێ ، من حەجم لەسەر نیە !! هەرچەندە زۆریشم حەز لێیە بەلام هیچ شتێك شك نابەم بۆئەوەی بڕۆمە سەردانی ماڵی خوای گەورە !! کابرای فێڵبازیش گوتی :چۆنە من لەگەڵ خۆمت ببەم وتۆش هیچ دەست بۆگیر فانت نەبەی چون وهاتنەوە لەسەر من بێ ،پیاوە ساویلکەکەش گوتی جا کێ ئەم چاکەیە لەگەڵ کێ دەکات ! چۆن باوەڕت پێ بکەم ؟؟ئەگەر چاکەیەکی واڵە گەڵم بکەی  ئەوا تاقیامەت لەبیرت ناکەم ،هەر سوپاست ئەکەم و دوعای خێرت بۆدەکەم" کابرای فێلبازیش گوتی : من ئامادەم لەخزمەتت دام لەگەڵ خۆمت دەبەم و دەتهێنمەوە هەموو شتێکت لەسەر گیرفانی منە تۆهەر دیناریکیش خەرج مەکە من براتم برا!!تەنها برۆ ناوی خۆت بنوسە بەیەکەوە بەرێدەکەوین بەلام من تەنیا مەرجێکم هەیە !پیاوەکەش گوتی چیە؟؟

فێڵبازەکەش گوتی:-ئەویش ئەوەیە کەلە پێش چاوی خێزانەکەت و وەشایەتێك بڕیار بدەی و سوێند بخۆی کەبچیتە حەج تەلاق بخۆی ئەگەر نەچووی ئەوا تەلاقت بکەوێ ،چونکە من دەترسم

تۆپەشیمان ببیەوە پارەو پوڵی منیش بە فیرۆ بچێ !! من زۆر باوەڕ بەتۆ ناکەم ،هەرئەوەندە تەلاق بخۆی بەسە ،پاشان بەیەکەوە دەچینە ماڵی خوا، کابرای ساویلکە بەشایەتی هاوسەرەکەی تەلاقی خوارد کە ئەگەر نەچێ بۆ حەج تەلاقی بکەوێ وژنەکەی وەکو خوشکی بێ ئەوجا کاتی حەج هات و کابرای فێڵباز نەپارەی داو نەلێی پێچاوە وە خۆی لێ بزر کرد ،گوایە چۆتە حەج ،خەڵکی بەرەو حەج بەرێکەوتن ،مێردی ژنەکەش لەبەرهەژاری مایەوە نەیدەتوانی بەرەو ماڵی خوا بەڕێبکەوێ ،کەوتە خەم وخەفەت وئەو سەرو ئەوسەر بەدوای کابرای فێڵباز دەگەڕا بەلام نەی دۆزیەوە لەدخان داما!! ....شەرمەزاری ژنەکەشی بوو !!ژنەکەش زۆرخواناس بوو گوتی:پیاوەکە تۆتەلاقت نەخوارد کە بچیە حەج گەر نەچووی تەلاقت بکەوێ، ئێستاش تۆ تەلاقت کەوتوە، من ناتوانم نزیکت ببمەوە وە، من و تۆ لێك حەرامین وەنابێ چیدی بێیەوە ئەوماڵە ،یان ئەوەتە بڕۆ حەج یانیش بەجێم بهێڵە وچارەسەری خۆت بکە ، خوا هەڵناگرێ پاش تەلاق کەوتنت چاوت بەچاوم بکەوێ، پیاوەکە ناچار ژنەکەی جێهێشت وئاوارەبوو، ئەو ماڵ و ئەو ماڵی دەکرد، هەر ڕۆژەو هەرشەوە لە ماڵی خزمێك یان لەدەرگایەگ رۆژی دەکردەوە خەڵکی هەراسان کردبوو ،بۆیە رۆژێك

واڕێکەوت چووە لای پیاوێکی باش باسی حاڵی خۆی وپیاوە فێلبازەکەی بۆگێڕایەوە.....هتد

کابرای پیاو چاکیش گوتی:بەڕاستی لەبەر ئەوەی تۆستەمێکی گەورەت لێکراوە ،بۆیە من بە پشتیوانی خوا دەتنێرم بۆحەج ،تاکو تۆماڵەکەت لێ تێك نەچێ و ژنەکەت تەلاق نەدرێ ،من دەتنێرم بۆحەج بەلام نابێ لای کەس باسی من بکەی و ناوی من ئاشکرا مەکە، من هەرئەوەندە دەتوانم تا دەتگەیەنمە حەج ،بەلام هاتنەوەت لەسەر من نیە تەنها لەوێ لەمەکە پیاوێکی مل خوار هەیە ناونیشانت دەدەمێ کەحەجت تەواو کرد دەتوانی بچیت بۆلای، سەلامی منی لێبکەو پێی بلێ:یارمەتیت بدات بۆگەڕانەوەت ،بەلام بەو مەرجەی تا دەمری ناوی من لای کەس نەدەی کەچۆن چویت بۆحەج ،پیاوەکەش سوێندی خواردوو یارمەتیەکەی وەرگرت هەرئەوەندەی بینی واله مەککەیە . تەوافی کعبەی خوا دەکات و خەلکی ناسیاروو گوند هەمویان سەریان سوڕما، دەیانوت چون هاتووە؟بەوهەژاریەوە چۆن والەگەڵ ئەواندا دەسورێتەوەو سەفاومەروا دەکات مەراسمی حەج جێ بە جێ دەکات زۆر لێ ی دەپرسی چۆن هاتوەو چۆن گەیشتە ئێرە؟چۆن وازوو بەوان گەیشتەوە؟

بەلاّم ئەویش هەر خۆی لەم وەلاّمە دەپاراست و دەی گوت : ئەگەر خواحەز بکات ،بیەوێ شتێك بکات ئاسانە و قسمەتی خوایە، باسی هاوکاری پیاو چاکەکەی نەدەدرکاند و ناوی نەدەهێنا هەر سوپاسی خوای دەکرد، لەکابرای فێلباز رزگاری بوو، خواش قەرەبوی بۆکردەوە بەسەلامەتی وسانای گەیشە حەج و تەلاقیشی لەژنەکەی نەکەوت و مالّیشی کاولّ نەبوو ، جا کەحەژن هاتو حەج تەواو بوو چووبۆلای ئەو پیاوە مل خوارەی کەناو نیشانی وەرگرت بوو لە مەککە سەلاّمی پیاو چاکەکەی پێ گەیاند و پێی گوت گوایە پارەی لێبڕاوەو خەرجی چونەوەی نیە ،کابرای خێرخوازیش زۆر بەخۆش حالیەوە پێشوازی لێکردو چەندی پێویست بوو دایە دەستی و بەرێی کرد، ئەویش زۆر دوعای خێری بۆکردو بەگەلّ خەلّکە ناسراوەکە کەوتەوە، بەرەو مالّ و کوردستان بەرێ کەوت، کەگەیشتەوە گوندەکە خەلّکە کە دیتییان وا کابرای هەژار لەگەلّ حاجیانی ئاواییە مەندیلی لەسەرەو حاجییەکانیش شاییەتییان دا ،کەلەگەلّ ئەوان حەجی کردووەو هاتۆەتەوە، ژنەکەش زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردوو حاجی بەحەلالی و سەربەرزی چووە مالّەکەی خۆی لەگەلّ ژنەکەی دا شادبوونەوەو مالّیان ئاوەدان بۆوە بەلام ئاوایەکە هەموو سەرییان سورمابوو کەچۆن حاجی بەو

درەنگەوە گەیشتە حەج و زۆر پرسیاریان لێ دەکرد کەئەو کاتانەش فرۆکەی حەج نەبووە؟ .جا هەرچەندە بەڵێنی دابوو نهێنیەکە ئاشکرا نەکات،بەلاَم زۆریان بۆهێناو ناچار بوو ناوی پیاو چاکەکەی ئاشکرا کردئەوجا خەڵکی دەستیان کردبە سەردانی پیاوچاکەکەو دەستیان ماچ دەکرد،وای لێهات بەشێخێکی گەورەو کەرامەت دار تەماشای بکەن، هەندێك باوەڕیان بەم کەرامەتە دەکردوو هەندێکیش نەدە چووە مێشکییان، کەسێك بەچاو نوقانێك بچێتە حەج ،کابرای پیاو چاکیش ناچاربوو کەنهێنی چاکەکەی خۆی ئاشکرا بکات بۆئەوەی خەڵکیش چاوی لێ بکەن، لەو هەموو پرسیارە زۆرەی ئەو خەڵکەش دەربازی بێ، هەرچەندە دڵیشی لەحاجی شکا بوو کە پێی گوت نهێنیەکە ئاشکرا نەکات،بەلێنی پێدابوو بەلام حاجیش لەبەر چاری ناوی ئەو کەسەی دابوو لێی خۆش بوو گەردەنی ئازاکرد هەرچەندە زۆریشی پێ دلگران بوو کە نهێنیەکەی ئاشکراکردبوو ...

گوتی خەڵکینە هەرچەندە زەهرخواردنەوەم لا ئاسان ترە لەوەی کەنهێنی خۆم ئاشکرا بکەم بەهەر حاڵ زۆر شتم لێ ئاشکرابوو ،بەهۆی ئەوحاجیەو باباسی خۆمتان بۆبگێرمەوە ئەگەر خوا ڕێزی لێنابم و کەڕامەتی پێ بەخشی بم ، گوتی :-

لەسەرەتای تەمەنی گەنجی بووم باوکم ژنێکی بۆخواستم نەدی و نە ناسیار بوو کاتێ ژنەکەم گواستەوەو هێنام بینیم ژنەکە سکی پڕ بوو، منیش لەبەر خاتری خوای گەورە دەنگم نەکردو دامپۆشی ،ئەم فەرموودە پیرۆزەم هاتەوە یاد کەپێغەمبەری نازدارﷺ فەرموویەتی :

﴿مَنْ سَتَّر مُؤْمَنافي الدُّنْيا سَتَرالله في الدُّ نْيا وَالآخِرة ﴾ ، هەرکەسێك عەیبی موسولمانێك لە دونیا داپۆشێ خواش لەدنیاو دوای عەیبی دادەپۆشێت

بەلێ بۆخاتری خوا دامپۆشت چونکە ژنەکە زۆر پەشیمان بوولەتاوانەکەی، تەوبەی کردبوو پەنجەی پەشیمانی خۆی دەگەست ، پاش ماوەیەك ئەوژنە لەشەوێكدا منداڵە کەی بوو، نەمزانی چی لەکۆرپەلەکە بکەم !! هەرچەند سەرم هێناو برد نەمدەزانی چۆن لەدایك و باوکی خۆمیشی بشارمەوە چونکە کارەساتەکە گەورەتر دەبوو ،بۆیە ناچار پێش نوێژی بەیانی منداڵە کەمان پێچاو بەنهێنی پێش ئەوەی بانگ بدات بۆمزگەوتەکە چووم، کۆرپەکەم لەگەڵخۆم برد لەبن هەیوانی مزگەوتەکەم دانا، خۆشم گەڕامەوە کاتی بانگدان ،پاشان چووم بۆ مزگەوت بینیم وا کۆرپەلەکە زۆر دەگریا ،مامۆستاو خەڵکیش بە

دیاریەوە بەسەرسورما ی وەستابوون ،هەریەك فسەیەكی دەكرد

مامۆستا وتی :برainە ئەو كۆرپەلەیە خاوەنی دیار نیە بەهەر حاڵ

نابێ بەجێ ی بهێلین ،هەركەس دەتوانێ بەخێوی بكات ئەوا ئەو

كەسە و پێغەمبەر ﷺلەبەهەشتدا وەك ئەو دووپەنجەیە لەمن

نزیكە،خوای گەورەش لێی خۆش دەبێ ،منیش گوتم مامۆستا من

ئامادەم ئەو منداڵە وەربگرم و پەروەردەو بەخێوی بكەم

مامۆستاش گوتی : كاكە تۆ هێشتا ژنەكەت بووكە چۆن دەتوانێ

ئەو منداڵە بەخێو بكات؟؟ دەترسم گەربیبەیەوە هەردەریشتان

بكات!!!منیش گوتم مامۆستا ژنەكەم ناتوانێ لەقسەم دەرچێ بیدە

بە من ،منیش بردمەوە دایك و باوكیشم ئاگادار كردەوە، گوتم: ئەو

منداله لەمزگەوت فڕێ درابوو كەس نازانێ منداڵی كێیە؟ منیش

لەبەر خاتری خوای گەورە هێنامەتە وە، بە ژنەكەم گوت:

پێویستە وەكو دایكی بەخێوی بكەی ئەگەرنا نەهیچی من و

نەهیچی تۆ تۆدەبیتە دایكی ، ژنەكەشم وەری گرت ڕازی بوو گوتی

: بەڵێ ئەوە چاكەی منە كە من بۆخوا ئەم كارەم كردووە ،

وگەوەرترین ئابرووچوونم پەردە پۆش كرد بۆ خوا، خواش بەوە

ڕێزی لێناوم وئەو كەرامەتی پێداوم .....

## لەدەرگای خەڵکی بدەی لەدەرگات دەدرێتەوە

ماموستایەك گێڕایەوە گوتی: رۆژێك گەنجێك زۆر بەتوڕەیی و پەشۆکاوی هاتە لام و گوتی:- ماموستا خراپم لێ قەوماوە ،ماموستاکە دەڵێ گوتم: چیت لێ قەوماوە؟  گەنجەکە وتی: خێزاندارم منداڵێکیشم هەیە لەناکاو کە چومەماڵەوە بینیم گەنجێك لەماڵەکەمدا دەرپەڕی زینای لەگەڵ ژنەکەمدا کردبوو! ،ماموستاش گوتی : پێم گوت ...تۆئەوقورئانە تۆش هیچ جار زینات لەگەڵ ناموسی خەڵکدا نەکردووە ؟؟

گەنجەکەش وتی !

بەڵێ بەخوا لەگەڵ ژنە بەمێردەکان زینام کردووە ....

ماموستاش دەڵێ گوتم ......

دەبخۆ نەت بیستوە ئەوەی لەدەرگای خەڵکی بدات لەدەرگای دەدرێتەوە ؟؟

برۆ هەتا زووە بۆخۆت تۆبە بکە.........دەنا بەخوا هێشتا لە دەرگات دەدرێت.

## ملوانکەی زێڕ

لە گوندێك پیاو چاکێك هەبوو ، بە وەلیان دادەنا زۆر لە خوا ترس وچاکەکارو بانگخوازوخەم خۆری ئایین بوو ، بۆیە خەڵکەکە زۆریان خۆشدەویست وسەردانیان دەکرد، مشوری خەم وئازارەکانی ئەوانی دەکرد،ڕێنمایی دەکردن ونزای چاکی بۆیان دەکردو هەمیشە خێر و خۆشی ئاوایيەکەی دەویست ،لەچارەسەری گیروگرفت وکێشەکانیان دابوو ،دەڵێن هەردوعایەکی بکردایە خودا بێئومێدی نەدەکرد ،خوا هەمیشە وەڵامی دەدایەوە ،ئەم پیاو چاکە قە دەری خودا سەفەری حەجی کردو زۆرجاریش دوعای دەکرد کە خودا لەماڵەکەی خۆی ئامانەتەکەی لێ وەربگرێتەوە، بەیەکجاری لەمیوانی خانەی خوا لەوێ بمێنێتەوە وبمرێ،جا لەخانەی خودا لەوێ وەکودیاری ملوانکەیەکی زێری بۆکچەخۆشەویستەکەی خۆی کڕی کەبیباتەوە بە دیاری بۆی ،بەڵام قەزاو قەدەری خودا هەرلەوێ ملوانکە زێڕەکەی بزرکرد ،پێش گەرانەوەش، دوعاکەشی گیرابوو هەرلەوێ نەخۆش کەوت وکۆچی دوای کردوو ئاواتی هاتە دی هەرلەوێ نێژرا ، بەلام بەر لە مردنی وەسیەتی کرد کە ئاگایان لەماڵ و خێزانەکەی بێ و کەل و پەلەکانیان پێ بگەیەنن کە گەڕانەوە ئاوایەکەیان سەلامیان لێ بکەن

جالەکاتی گەڕانەوەی حاجیان ، کاروانێکی حاجیان بە ئاوا ییە کەی ئەوپیاوچاکەدا تێدەپەرێ و لەوێ وەکو قۆناغێکی پشودان دەمێنێنەوە تاوەکو حەسانەوەیەك بدەن و جالەو کاروانەدا گەنجێکی زۆر ڕێك و زانا ولەخوا ترس بوو لەناویان دابوو،پێشنوێژوسەرپەرشتی، کاروانەکەی حاجیەکانی دەکرد ،ئامۆژگاری ،کاروانچیەکانی دەکرد ،لەو کاتەدا خەڵکی ئاوایەکەش دەیناسن و زۆرخۆشیان دەوێت ،داوای لێدەکەن کە لای ئەوان بمێنێتەوە لەجیاتی پیاوچاکەکە ببێتە مەلای گوندەکەیان ،ئەویش ڕازی دەبێ ودەڵێ بەڵام هەتا پرس بەدایك وباوکم نەکەم و نەچمەوە سەرێکیان لێ نەدەم ،هیچ بەڵێنتان نادەمێ ئەوەبوو بەرەو ماڵی خاوخێزانی باوانەکەی خۆی گەرایەوە بەدایك وباوکی شاد بووەوە پاش ماوەیەك ئەم داوایەی گوندەکەی بە دایك و باوکی گەیاند کە حەزدەکەن لای ئەوان سەرپەرشتی مزگەوتەکەیان بکات،وەکو گەنجێکی مەلای زاناو خواناس، دایك وباوکەکە ڕازی بوون کوڕەکە گەڕایەوە لای خەڵکەکە ، پاش ماوە یەك کە دەست بەکار بوو وەکو مەلایەکی ئاوایەکە،جاخەڵکەکە پێیان وت ـ مامۆستا تۆ کە گەنجی هێشتا ژنت نەهێناوە ،پێویستە خەمت لێ بخۆین و حەزدەکەین ببیە خاوەن ماڵ وخێزان ئەوجا

گوتیان: له گوندەکەمان کچێکی زۆردیندارو خواناس و قورئان خوێن هەیە کە هەر شایەنی تۆیە ،ئەمساڵ باوکی چوو بووە حەج هەر لەوێ مردو نەهاتەوە خوا ئامانەتەکەی خۆی لێ وەر گرتەوە ،بۆیە حەز دەکەین ئەو کچە چاکە بخوازی ،ئەویش بگاتە ماڵ وحاڵی خۆی ،کورەکە رازی بوو یەکتریان دیت وپێك رازی بوون پاشان ئامادەسازی زەماوەندیان کردوبوکی گواستەوە لەیەکەم شەوی بوکێنی دا چووە لای بووك،زاواش ویستی وەکودیاریەك بداتە بووکی تازە بۆیە ملوانکەیەکی زێری لەگیرفانی دەرهێنا وپێشکەشی ژنەکەی کرد ،یەك سەر بووکەکەش باوکە خواناسەکەی بەبیر کەوتەوە دەستی بەگریان کرد زاوا لێی پرسی :ـ بۆدەگری ؟ کچەکەش گوتی :ـ باوکم بەبیر هاتە وە کە لەحەج کۆچی دوای کرد دەگێرنەوە ملوانکەیەکی زێری بۆم کری بوو بەڵام هەرلەوێ لێی بزربوو ،بەڵام داوای لە خودا کردبوو هەر کەسێك ئەو ملوانکەیە بدۆزێتەوە ببێتە قسمەتی کچەکەی ،باوکم هەر دوعایەکی بکردایە هەر خودای گەورە لێی قەبوڵ دەکرد ،تەنها ئەودوعایەی باوکم نەبێ قەبوڵ نەبووە زاواکەش گوتی دەبەخودا منیش ئەم ملوانکەیەم لەو جێگایە دۆزیوە کەباوکت لێی ونی کردبوو

کەدوعای کردبوو ئەوکەسەی بیدۆزێتەوە ببێتەمێردی تۆ ئەوە ملوانکەکەی تۆیە منش ئەو کەسەم کە خوداپێکی شاد کردین....

## کچی قازیەك

له ناوچەی خوراسان قازیەکی زۆر خوا ناس و ناسراو هەبوو بەناوی(نوح المرزوی) ئەم پیاوە دەوڵەمەند و خاوەن باخ و باخات بوو خوا زۆری بەسەرداباراند بوو، کچێکی جوان و شۆخ و شەنگی هەبوو، وێنەی لە جوانی نەبوو، ئاقڵ و هۆشمەند بوو،بۆیە زۆر لە دەسەڵات دار و پیاو ماقوڵان و گەنجانی دەوڵەمەند چاویان تێبڕیبوو دەچوونە داخوازی،بەڵام قازی باوکی ڕازی نەدەبوو بە شوی بدات!!.

قازی ڕەنجبەرێکی هندی ڕەش پێستی بەناوی(مبارەك)هەبوو کە خزمەتی باخ و باخاتەکانی دەکرد و ئاودێری دەکرد مانگێك دوایی دەست بەکاربوونی ئەو ڕەنجبەرە قازی بەسەیران دەچێتە ناو باخ و باخاتەکەی بۆ ڕابواردن لەوێ کە دادەنیشێ داوا لە ڕەنجبەرەکە دەکات هێشوە ترێیەکی بۆ بقرتێنێ و بۆی بهێنێ ،ئەویش دەچێتە لای مێوێك و هێشوە ترێیەك دەقرتێنێ و دەیشواتەوە و دەیهێنێ

له بەردەم قازی دادەنیٚ، ئەویش دەستی بۆ دەبات كه بیخوا تامی كرد دیتی ترشه،قازی پیٚ ی دەلیٚ:ئەوە ترشه بڕۆ تریٚیەكی شیرینم بۆ لیٚ بكەوە، ڕەنجبەرەكەش دەچیٚ دیسان وشییەتریٚیەكی تر دیٚنیٚ دیسان تامی دەكات و دەبینیٚ هەم ترش دەرچوو !!!! قازی پیٚی دەلیٚ تۆ ماوەیەكه لیٚرەی نازانی كام تریٚ شیرینه ؟!! موبارەك دەلیٚ:گەورەم تۆ منت داناوە وەك چاودیٚر و ئاودیٚری خزمەتكاری باخەكه نەت گوتوە: لیٚ ی بخۆ! بۆیه نازانم كامی ترشه كامی شیرینه چونكه تامم نەكردووە.

قازی زۆر سەری سوڕ دەمینیٚ لەم قسەیه و پیٚی دەلیٚ:خوا تەمەنت دریٚژ بكات، بۆ خۆت و ئەمانەت پاریٚزیەكەت، زۆر بەدیقەت سەرنجی داو له دلّی خۆیدا گوتی: بەخوا كوریٚكی له خوا ترسه و دەستپاكه و جیٚ ی شانازیه بۆیه پیٚ ی گوت:خۆشەویستیت چۆته نیٚو دلّم و زۆر بەڕیٚز و جیٚ ی باوەڕی،لەبەرئەوە چیت پیٚ دەلّیٚم گویٚڕایەلیم بكه و منیش پرس و ڕاویٚژت پیٚ دەكەم؟.

موبارەك گوتی: من گویٚڕایەلّی خوایی گەورەم و بەر فەرمانی جەنابتم.

دوای ماوەیەكی زۆر،لەدوای چەندین هەلسەنگاندنو وردبوونەوە لەهەلسوكەوتەكانی ئەم بەندەیە،

قازی گوتی: ئەی چاودێری ڕاستگۆ و خواناس من کچێکم هەیە زۆر خواناس و ژیرە ،زۆرم خۆش دەوێ ، زۆر لە پیاو ماقوڵ و دەوڵەمەندان داوایان کردووە بەڵام من گفتم بەکەسیان نەداوە پێت باشە بەکامیان بدەم؟

موبارەك گوتی: بێ باوەڕان لە سەردەمی بێ باوەڕی ئافرەتی ڕەسەن و پلەوپایە بەرزیان دەخواست! جولەکە کانیش بەدوایی ئافرەتی جوان دەگەڕان کە بیخوازن ، بەڵام لەکاتی ئیسلام و پێغەمبەر(ﷺ)خوادا لە دوایی ئافرەتی ڕەوشت جواندا دەگەڕان ،بەڵام لەم سەردەمەی ئێمەدا خەڵکی بەدوایی ماڵ و سامان دا دەگەڕێنجاتۆش لەم جۆرانە کامیان هەڵدەبژێریوبەکەیفی خۆتە؟

قازیش لە وەڵامدا گوتی:دیندار و خواناسەکە هەڵدەبژێرم دەمەوێ کچەکەم بدەم بەتۆ!چونکە تۆ زۆردیندار و وەفادار دەبینم.

ڕەنجبەرەکە گوتی:جا قوربان من بەندەیەکی هندی بێ دەسەڵات و ڕەش پێستم!چۆن کچی خۆت بەمن دەدەی؟چۆن کچی تۆ بەمن ڕازی دەبێ؟!!!

قازی پێی گوت:هەستە بابچینەوە ماڵ،کە گەیشتنە ماڵ و دانیشتن قازی قسەی لەگەڵ ژنەکەی کرد و پێناسەی ڕەنجبەرەکەی کرد و

ژنەکەشی بەو ڕازی کرد.

ئەویش گوتی: باشە باکچەکە بێت و پرسی پێ بکەین ئەگەر ڕازی بوو ئەوە ئێمە لاریمان نییە،کچەکە هات و گوتی : بابە گیان من قسەتان ناشکێنم و هەرچی ئێوە بیڵێن من ڕازیم، شوی پێ کرد.

بەرێزان دەزانن لەم هاوسەرگیریەی ئەم دوو خواناسە کێ پەیدا بوو؟بەڵێ زانایی بەناوبانگ(عبدلله ی کوڕی موبارەك) پەیدا بوو، کە بە زانستەکانی شەریعەتی خوا هەموو سەر زەوی پڕ کردبوو.

جارێکیان لە بارەی فەرموودەی پێغەمبەر(ﷺ)لێیان پرسی ئەی (عبدالله) ئەگەر پێت بڵێن ئەمڕۆ عەسر دەمریت هەتا ئەو کاتە چی دەکەیت؟!!،گوتی: بەدوایی زانستدا دەگەڕێم کە پلەیەك پێی بەرزتر ببمەوە بەرەو خودا.

جا ئەی دایکان و باوکان با هەموو لایەك چاو لەو قازیە زانایە و خێزانەکەی بکەین بۆ کچەکانمان بەدوایی گەنجی خواناس و خاوەن ڕەوشت و دینداردا بگەڕێین و کچەکانمان پێشکەشی بکەین وەك ڕەنجبەرە ڕەشەکەی زاوای قازی نوح نەك شەهادە و پلە و پایە و ساماندراری دەبا ئەمە نمونەیە ببێتە سەرمەشق و پەند و ئامۆژگاری بۆدوا ڕۆژی خۆمان و منداڵ و نەوەکانمان.

# بەختەوەری

ئــەی شــەونخون کارەکــەی شــەوگار
بەختــەوەری تــۆ بۆتــە خــەیاڵ

ڕەنگــە لــە کاولێــك خۆشــی هــەبێ
چــــنگە نانێکیشــــی تێــــدا نــــەبێ

هــەروا ڕەنگــە کۆشــکی بــەرز وتــەلار
بــێ بــەش بــن لــە نازکێشــانی نــازدار

هــەروەکو چــۆن جــەژن دێ یــەکجار
بەختــــەوەریش وابــــێ بــــۆ بــــێ یــــار

تــۆش بــە ڕوو گــرژی ومــۆنی ڕووخسـار
پاداشــتێکت نــابێ لــە کــرد گــار

ڕەمەزان/١٤٢٨

## کچێکی زانا

سەعیدی کوری ئەلموسەیەب لە گەورە پیاوانی تابعین و قوتابی و هاوەڵی پیغەمبەر(ﷺ)ئەبو هورەیرە بوو ، هەرچەندە بڵێن ناودار و شەرعزان و پیاوێکی بلیمەت بوو،خاوەن بیرو بۆچونێکی فراوان بوو لە فەرموودە و فیقهی ئیسلامی.

بەردەوام خەریکی دەور و دەرس گوتنەوە و وانەی شەرعی بوو بە فەقێ و قوتابیەکانی، خەڵکانێکی زۆر لە بەردەستیدا بوونەتە زاناو شەرعزان و پێشەوای چاك ، ئەو پیاوە بەرێزە کچێکی هەبوو چەندە بڵێی شۆخ و شەنگ و بەرچاو بووسەرەرای ئەوەش شارەزا بوو لە عیلم و زانستەکانی ، زۆر لە پیاو ماقولانی ئەو کاتە چاویان لە کچەکەی بری بوو و داوایان دەکرد!یەکێ لەوانە خەلیفەی موسڵمانان عەبدومەلیکی کوڕی مەڕوان داوای لێدەکرد بۆ وەلیدی کوڕی،کە جێنشینی باوکی بوو، چووە خوازبێنی،بەڵام سەعیدی باوکی کچە ڕازی نەبوو بیداتێ ، واتا ڕازی نەبوو بەوەی کچەکەی ببێتە هاوسەری ئەو وەلیدە کەوا پاش باوکی دەبێتە خەلیفە ی موسلمانان !!

- مامۆستا (سەعید کوڕی ئەلموسەیب) فەقێیەکێ هەبوو بەناوی (ئەبو وداعە)، ماوەیەکی زۆر بوو لای سەعید

دەرسی وەردەگرت ودەخوێند ئەم فەقێیە زۆر دیندار و
ئاین پەروەر بوو،قەدەری خوا وا بوو چەند ڕۆژێك ئەو
قوتابیە دیار نەماو نەدە هاتە دەرس لای ماموستاکەی بێ
ئەوەی ماموستایی بیزانێ بۆ؟!دوای ئەو دیار نەبوونە
چەند ڕۆژێ (ابو وداعە) هاتەوە و دەستی بەدەرس
خوێندن کردەوە !سەعیدی ماموستاش لێ ی پرسی:
هۆکاری چی بوو چەند ڕۆژە دیار نەبووی؟! ئەویش گوتی:
بەخوا ماموستا خێزانەکەم نەخۆش بوو دوایش وەفاتی
کرد ، بۆیە خەریکی ئەوە بووم!ماموستا سەعید پێی
گوت:سبحانە اللە ئەی بۆ منت ئاگادار نەکردەوە تابە
ئەرکی خۆم هەڵسم!! بەشداری نوێژو شاردنەوەو
پرسەکەتان بکەم، ئەویش گوتی: لە بەرئەوەی جەنابت
خەریکی دەرس و دەوری،نەم ویست ئەزیەتت بدەم و
بەدەم منەوە بێیت و دەرسەکانت بڕوات!چەند ڕۆژێ دوایی
ئەوە سەعید لە (ئەبو وداعە)ی پرسی ئایا بەتەما نیت ژن
بهێنی؟ ئەویش گوتی: جا قوربان کێ ژن دەدات بەمن
کەوا هیچ ماڵ و سامان و کەلوپەلی وام نییە لە ماڵەوە و
تەنیا چوار درهەمم هەیە!!سەعیدی گوتی سەعیدی کوڕی

ئەلوسەیەب کچت دەداتیٚ!!ابو وداعە واقی ورماو

گوتی:چۆن کچت بە من دەدەیت؟من کەسێکی هەژار

داماو؟مامۆستا گوتی بەڵێ کچی من شایەنی تۆیە!!

ئیتر بەو شێوەیە دوایی پرس و ڕای کچەکە و خێزانی لە پێش دوو شاهید کچەکەی مارە کرد لە (ابو وداعە)،دوای ئەوە پێ ی گوت:دەبڕۆ بۆ ماڵەوە و خۆتان ئامادە بکەن بۆ گواستنەوەی خێزانەکەت ئەوەی هەتانە لە ماڵەکە ڕێکبخەن، جا هەمان شەو دوای نوێژی عیشا مامۆستا سەعید دەستی کچەکەی گرت و بردی بەرەو ماڵی زاوا ڕۆیشتن !!بە دەستی خۆی کاتێ لە دەرگایی دا (ئەبو وداعە) گوتی کێیە لە دەرگا دەدات؟ مامۆستا سەعید گوتی سەعیدی کوڕی ئەلوسەیەب،ابو وداعە لە دڵی خۆیدا گوتی:وا دیارە سەعید پەشیمان بویتەوە و هاتووە ئیشەکە تێك بدات!! بۆیە وا بەپەلە هاتۆتە بەر دەرگائەویش دەرگاکەی لێ کردەوە، خەیاڵی ڕۆیشت چۆن سەعید دێتە بەر دەرگای ماڵی ئەو بەو هەموو ناوبانگ و گەورەییەو مامۆستاییەتییەی؟هەر ئەوەندەی زانی وا دەستی کچەکەی گرتوە و بە زوورەوە کەوت گوتی : ئەوە هاوسەرەکەت هاتووم بۆتم هێناوە با ئەو شەوەش بەتەنیای نەبییت، دەرگاکەی داخستەوە و بەرەو ماڵەوە گەرایەوە !ئەبو

وداعەی بەم جۆرە بە هاوسەری خۆی شادکرد ، بەخۆشی شەوگارەکە یان بەسەر برد ، پیرۆزی یەك بوون بەیانی دوایی نوێژی بەیانی و نانخواردن ئەبو وداعە ویستی بڕواتە دەرەوە،خێزانی گوتی:بۆ کوێ دەچیت؟گوتی:دەچم بۆ لای باوکت دەرس بخوێنم:ژنەکەی دەستی گرت و پێی گوت:بۆ کوێ دەچی وەرە بامن زانیاری و زانستی سەعیدت فێر بکەم هەموو وا لای منە !ناتەوێ ئەوەی لای باوکم لە عیلم و زانستی گشتی فێرت بکەم؟!

خۆشی و شادی بۆ ئەو دوو هاوسەرە بەختەوەرە کەوا لە سەر بنەماکانی شەرعی خوا بەیەك گەیشتن کە هاوشانی یەکتری بوون وکە سەعیدی کوڕی ئەلوسەیبی زاناو دانا مامۆستایان بوو، هەروەکو خوایی گەورە لەم ئایەتە پیرۆزە فەرمان دەکات و دەفەرمووێت: (الطيبات للطيبين والطيبون للطيبات).

واتە : کوڕانی چاك و پاك بۆ کچانی چاك و پاکن و و هەروەها کچانی پاك و چاك بۆ کوڕانی پاك و چاك بن (لێکیان مارە بکەن).

# برا یان بەلا!!

خالید کەمێك بێ دەنگ بوو ئینجا وتی : سوپاست دەکەم ئەی صالح لەسەر ئەو هەستە ناسکەت منیش وا هەست دەکەم کە بەڕاستی پێویستیم بەکەسێکە کە پەژارەو گرفتی خۆمی لەلا هەڵبڕێژم بۆ ئەوەی یارمەتیم بدا بۆ چارەسەری خالید ڕاست بۆوە، لەدانیشتنەکەی وکوپێك چای بۆ صالح تێکردو گوتی :

ئەی صالح کێشەی من هەروەك دەزانی خێزانـدارم وهەشت مانگە من وخێزانەکەم بەتەنیا لەماڵێك دەژین ،بەڵام گرفتەکەم ئەوەیە کە برا بچوکەکەم (حەمەد) بیست ساڵانە خوێندنی دواناوەندی تەواو کردووە ، ئێستا لەزانکۆ لێرە وەرگیراوە پاش هەفتەیەك یان دوو هەفتەی تر دێتە ئێرە بۆ خوێندن ،بۆیە دایك وباوکم داوایان لێکردومە زۆر بەتوندی کەوا (حەمەد) لەماڵی خۆمان بحەوێنمەوە لە جیاتی ئەوەی لەبەشە ناوخۆی کوڕان لەگەڵ برادەرەکانی نیشتەجێ ببێ ،،چونکە دەترسن توشی لادان و گومڕای بێ چونکە وەك دەزانی لەوێ خەڵکی چاك و خراپو هەرچی و پەرچی و ژێرو دۆڕاو کۆدەبنەوە ،هاوڕێش سەرنج کێشە منیش ئەو داوایەم

ڕەت كردەوە چونكە بونی گەنجێكی هەرزەكار لە ماڵم بەمەترسی دەزانم هەموشمان بەژیانی گەنجی و هەرزەكاری دا تێپەریوین و چاك دەزانین ، ڕەنگە من كەلەماڵ دەردەچم ئەو هێشتا لەماڵ لەژوورەكەی نوستبێ یان هەندێك جار چەند ڕۆژ لەماڵ دەربچم بەهۆی كارو كاسبی (..یان ..یان.... )لێت ناشارمەوە پیاو چاكێك ئامۆژگاری كردم لەو بابەتە پێ ی گوتم: كە رێ نەدەم بۆكەس كەوا لە ماڵەكەم لەگەڵ خێزانم دا بێت، ئەم فەرمودەی خۆشەویستی پێ گوتم : (الحمو ا لموت) واتە مەترسیدارترین كەس خزمانی مێردەكەن وەكو براو مام وخاڵ وكوڕەكانی لەبەر ئەوەی ئەوانە زۆر بەئاسانی بەژوور دەكەون وكەسیش گومانیان لێ ناكات لێرە ئاژاوەی گەورەو ناهەموار دروست دەبێ .

هەروەها لێت ناشارمەوە ئەی صالح كەپیاو لەماڵەوە خۆی لەبەر دەكاتەوە لەگەڵ خێزانەكەی بۆ ئەوەی بحەسێتەوە ئەوەش لەگەڵ برام لەیەك ماڵدا ناشێ، خالید كەمێك بێ دەنگ بوو قومێكی لە چایەكەی داو گوتی : ئەو بابەتەم بۆدایك وباوكم باس كردووڕای خۆم بۆگوتن وسوێندم خوارد بەخوای گەورە كەمن داوای خۆشی بۆ (حەمەد)ی برام دەكەم لێم توڕەبون وشاڵاویان بۆ هێنام لەلای خزمان، تاوان باریان كردم بەخراپەو پێناسەیان كردم بەوەی

کەمن دڵ نەخۆش و نیاز خراپ و مەبەست پیسم، لەبەر ئەوەی گومانی خراپە بەبراکەم دەبەم وئەویش خێزانی من وەکو خوشکە گەورەی دادەنێ .
پێیان گوتم گوایە من حەسودم وپێم خۆش نیە براکەم خۆشی ببینێ حەز ناکەم خوێندنی زانکۆ تەواوبکات ،لەوەش خراپتر باوکم هەڕەشەی لێکردم وگوتی :ئەوە ئابرو چونێکی گەورەیە لەناو خەڵکی چۆن دەبێت برات لەگەڵ بێگانان بێت تۆش ماڵت هەبێ بەخوا ئەگەر (حەمەد)نەحەوێنییوە ئەوا من ودایکت هەتا دەمرین ناتناسین و پاش ئەو ڕۆژە نامانناسییەوە و ئێمە لە دنیا لێت بەرین پێش قیامەت ،خالید کەمێك سەری لەقاندو گوتی: ئێستا من سەرسامم لەلایەك دەمەوێ دایك وباوکم ڕازی بکەم،لەلایەك نامەوێ بەختەوەری خێزانی خۆم بدۆڕێنم .ئەدی ئەی صالح تۆ ڕات چییە لەو گرفتە گەورەیە ؟
صالح لە دانیشتنەکەی ڕاست بۆوەو گوتی:بەڕاستی تۆ دەتەوێت ڕای من وەربگری بەروون وڕاشکاوی لەبەر ئەوە گوێم لێبگرە ئەی خالید بەڕاستی تۆ دوو دڵی وئەگەر نا ئەو هەرایە چیە بۆ ئەو هەمو گرفت وناکۆکییە لەگەڵ باوانت .ئایا نازانی ڕەزابونی خوا لەگەڵ ڕازی بونی باوان دایە ،تورەبونیشی لەگەڵ تورەبونی

ئەوانە،ئەگەر براکەت لەگەڵت لەیەك ماڵدا بژیت ؟!
برایەکەت لەکاتێ کەتۆ لەوێ نەبی بەکاروبارو پێویستی ماڵ هەڵدەستێ دەبێتە پیاوی ماڵ.
صالح کەمێك بێ دەنگ بوو تەماشای ئاسەواری قسەکەی خالیدی لە روخساری دەکرد بەردەوام بوو گوتی :بۆچی گومانی خراپە بەبرات دەبەی بە بێ بەڵگە وبەبێ تاوان تاوانباری دەکەی لەبیرت کرد کەخوای گەورەدەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱجۡتَنِبُواْ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعۡضَ ٱلظَّنِّ إِثۡمٞۖ وَلَا تَجَسَّسُواْ وَلَا يَغۡتَب بَّعۡضُكُم بَعۡضًاۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمۡ أَن يَأۡكُلَ لَحۡمَ أَخِيهِ مَيۡتٗا فَكَرِهۡتُمُوهُۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٞ رَّحِيمٞ (١٢) ﴾ الحجرات: ١٢
پێم بلێ ئایا باوەڕت بەژنەکەت نیە؟ باوەڕت بەبراکەت نیە؟
خالید قسەکەی بڕی و گوتی :من باوەڕم بە ژنەکەم وبرایەکەم هەیە بەڵام ئێ .... صالح قسەکەی بەگلیەوەو بڕی وگوتی: دیسان هاتینەوە سەر شك وگومان وخەیاڵ باوەڕ بکە ئەی خالید کە (حەمەدی) برات دەبێتە شوانێکی دەست پاك بۆ ماڵەکەت لەجیاتی لەوێ بی یان نا، نابێ بیر بکاتەوە کەتوخنی براژنی بکەوێ لەبەر ئەوەی بەچاوی خوشکی خۆی تەماشای دەکات .

ئەی خالید لێت دەپرسم ئەرێ ئەگەر (حەمەد)ی برات خێزاندار با ئایا دڵت بۆی دەچوو پەلاماری بدەی ؟
وابزانم وەڵامەکەت لەلای خۆت دیارە ، خالید بۆچی دایك وباوکت وبرات دەدۆڕێنی جیاوازی و ناکۆکی دەخەیە ناو خێزان بەخەیاڵ وگومان وشکی ناڕاست ،ژیربە باوانت ڕازی بکە هەتا خوات لێ ڕازی بێ ،بۆ رازی کردنی گومان ودڵە ڕاوکێ وگومانەکانت ئامۆژگاریت دەکەم کە (حەمەد)ی برات لەبەشی پێشەوەی ماڵەکەت بحەوێنییەوە ، دەرگای نێوان بەشی پێشەوەو ژوورەکانت داخە .
خالید بە قسەی (صالح)ی برادەری ڕازی بووهیچ چاری نەما بڕیاری دا (حەمەد)ی برای لەگەڵ خۆی لە ماڵیان جێبکاتەوە.
پاش چەند ڕۆژێك (حەمەد)ی برای گەیشتە فڕۆکەخانە خالید چوو پێشوازی لێکردو پێکەوە هاتنە ماڵێ، لەپێشەوەی ماڵەکەی (حەمەد)ی نیشتەجێ کرد بەو جۆرە کار بەڕێوە دەچوو ڕۆژگار تێپەڕی قەزاو قەدەر لەزانستی خوا دایە، پاش چوار ساڵ خالید تەمەنی گەیشتە سی وسێ ساڵ بابی چوار کۆرپە بوو.
وا(حەمەد)یش لەساڵی کۆتای خوێندنیەتی نزیك بۆتەوە لەدەرچونی لە زانکۆ ،
(خالید)ی برای بەڵێنی دایێ کە پیشەیەکی شیاوی بۆ پەیدا بکا

لەزانكۆ بۆ ئەوەی لەگەڵی بمێنێتەوە و لە ماڵیان تا ژن دەهێنێ جا لەگەڵی بچێتەوە ماڵی خۆی .

ئێوارەیەكیان خالید بەئوتومبێلكەی دەگەڕایەوە ماڵی كە پاش نیوە شەو بوو بەكۆلأنێكی نزیك ماڵی خۆیان دا تێپەڕی ،دوو تارمایی ڕەشی لەسەر شۆستەكە بەدی كردوو لێیان نزیك بۆوە ، دیتی پیرەژنێك كچێكی لەگەڵ بوو كەلەسەر زەوی ڕاكشاوە ،هاوار دەكاو دەقیژێنێ ( بەهانامان وەرن ڕزگارمان كەن خەڵكی خێرخواز ).

خالید تاساو لێیان نزیك بۆوە پرسی بۆچی لێرەنە ؟ پیرەژن گوتی:كە ئەوان خەڵكی ئەم شارە نین تەنیا هەفتەیەك لێرە دەمێننەوە وكەسیش ناناسن ئەو كچەش كچی خۆیەتی توشی ژانی منداڵ بون بووە ، مێردەكەشی بۆ كاسبی چووەو كچەكە خەریكە لەبەر ژان وئازار بمرێت، كەسیان دەست ناكەوێ بیانباتە نەخۆشخانەی منداڵ بوون .

پیرەژنەكە بەچاوی پڕ فرمیسك پێ ی گووت: تكایە پێت ماچ دەكەم كارێكی چاكمان لەگەڵ بكەو بمان گەینە نزیكترین نەخۆشخانە خوا خێزان و منداڵت بپارێزی لە هەموو خراپەیەك فرمێسكی پیرەژن و زریكەی كچەكە یەكیان گرتبوو لەسەر زەوی ،خالید دڵی پێیان سوتا پاڵنەری پیاوەتی و خێرو كۆمەكی لێ

قـەوماو بـە هانـاوە چـوونی بـێ نـەوایان بـوو کـە بیگەێنتـە نەخۆشـخانە و یارمـەتی پـیرە ژنـی داو کچـەکەیان خسـتە نـاو ئوتومبێل و بەخێرایی دەرپەڕی بەرەو نزیکترین نەخۆشخانەی لـە دایـك بـوون، پـیرەژنو وکچـەکە بەدرێـژای ڕێگـا لـەنزاو پاڕانـەوە نەکەوتن بۆ خۆی ماڵ ومنداڵی.

پـاش کـەمێك گەیشـتینە نەخۆشـخانە، پـاش پشـکنین کچـەکەیان بردە ژووری نەشتەرگەری، بۆ ئەوەی منداڵەکەی ببێ بەشـیوەیەکی سروشـتی :خالیـدیش لەبـەر پیـاوەتی و دڵنـەرمی و بەخشـندەی خۆی بەجێی نەهێشت ولای مایەوە بۆ ئەوەی دڵنیـا بـێ لـە ڕزگـار بوون ومنداڵ بوونەکـە بـە پیرە ژنیشـی گـووت :لـە شـوێنی پیـاوان چـاوەڕێتان دەکـەم تـا مزگێنـی ڕزگـاربونم دەدەنـێ و پەیوەنـدی بەژنەکـەی کـردو گـوتی کـەمێك گـیر بـووم وپاشـان بەسـەلامەتی دێمەوە .

خالید لە شوێنی پیـاوان دانیشـت بـوو پشـتی خـۆی بـەدیوار دابـوو ،خـەو بردیـەوەو هەسـتی پـێ نـەکرد ونـەیزانی چـەند خـەوی لێکەوتوە ، بەلاّم ئەوەی کە لە بیری ناچێ ئەو دیمەنـە بـوو کـە بـە ئاگاهات بـەهاوارێك چاوی هـەڵهێنا بینـی دوو پیـاوی ئاسـایش لێـی نزیك دەبنەوە پیرەژنـەکە دەقیژێنێ ودەناڵێتەوەو دەستی بـۆ درێـژ

دەكاو دەڵێ: ئەوە هەوە !...ئەوە خۆیەتی!!...

خالید سەری سورماو هەستاوە لەسەر كورسیەكەی و بەرەو دایكی كچەكە بەگەرمی چوو گوتی : كچەكە ڕزگاری بوو.

پێش ئەوەی پیرەژنەكە هیچ بڵێ ئەفسەرە ئاسایشەكە گوتی : تۆ خالیدی ؟ بەڵێ.

ئەفسەرەكە گوتی : پێنج دەقە وەرە ژووری بەڕێوەبەر ، هەمویان چونە ژووری بەڕێوەبەر دەرگایان لەسەر داخست و پیرەژن لێرە دەستی بەهاوارهاوار كردو ڕووی خۆی دەڕنانەدەوە وپرچی دەردەهێناو دەیقیژاند: ئەوە تاونبارە سفلەكەیە بیگرن بانەڕوا ، هەش بەسەر خۆت كچەكەم !

خالید هەندە بێ هۆش وسەرسام ما؟!لە هیچ تێناگات لە سەرسامی خۆی بە قسەی ئەفسەرەكە بەخەبەر هات: ئەو پیرەژنە دەڵێ: كەتۆ زینات لەگەڵ كچی كردووە ولەتۆ زگی بووە و ئەو منداڵەی لە تۆ بووە.

پاشان تۆ هەڕەشەت لێ كردوە وپەیمانت دایتێ كە بیخوازی بەلآم پاش منداڵ بوون ساوایەكە لەبەر دەرگای یەكێك لە مزگەوتەكان دابنێن وهەتا خێر خوازێك بیباتە خانەیەكی چاودێری كۆمەلآیەتی ، خالید ڕاچڵەكی بەبیستنی ئەم قسانە و چاوی ڕەش

بوو و بەر چاوی تاریك بوو وزمانی گیراو قسەی پێ نەكرا و كەوتە سەر زەوی و لەخۆچوو.

پاش كەمێك بەهۆش خۆی هاتەوە دیتی وا لە ژوورێكە و دووپیاوی ئاسایش لەسەری وەستاون ، ئەفسەرەكە دەستی بەقسە كردوو گوتی:

خالید بەڕاستی پێم بڵێ لەدەم و  چاوت دیارە پیاوەكی بەرێزو لە سیمات دیارە كە تۆ لەو كەسانە نی كە ئەو جۆرە تاوانە چەپەڵانە ئەنجام بدەی.

خالید بە دڵی شكاو گووتی: ئەی خەڵكینە ئەرێ ئەوە پاداشتی چاكەیە، بەو جۆرە چاكە دەدرێتەوە ، من پیاوێكی پاكم و بەناموسم و خاوەن خێزانم سێ مندالم هەیە دوو كورو كچێك(سامی وسعود،ومریم) خەڵكی ئێرەم و لە گەرەكێكی ناسراو، خالید خۆی پێ رانەگیراو فرمێسك لە چاوانی دەباری، ئەفسەرەكە پێی گووت: كارەكەت ئاسانە من باوڕت پێ دەكەم كە تۆ بێ تاوانی ، بەڵكو پێویستە ڕووداوەكە بە پێی یاسا بڕوات و پیویستە پاكی تۆ ئاشكرا بێت، ئەوەش ئاسانە، لەم جۆرە ڕووداوانە تەنیا هەندێك پشكنینی پزیشكی تایبەت دەكرێ بۆ ئەوەی راستی ئاشكرا بكرێ!!

خالیدیش قسەكانی بڕی كام راستی! بەراستی من بێ تاوانم پاكو

بەناموسم! دیارە باوڕم پێ ناکەن ، سەگیش بە وەفایە بەرامبەر ئەوانەی چاکەی لەگەڵدا دەکەن، بەڵام زۆر کەس لە مرۆڤەکان ستەم و سپلەیی دەکەن بەرامبەر ئەوانەی چاکەیان لەگەڵدا دەکەن...!.

بەیانی هەندیك لە ئاوی سپێرمی خالیدیان وەرگرت و ناردیان بۆ تاقیگە بۆ پشکنین و تاقیکردنەوەی پێویست ، خالید وئەفسەرەکە لە ژورێکیتر دانیشتبوون خالید وازی نەدەهێنا لەنزاو پاڕانەوە لەسەر ئەوەی هەرچی راستییە ئاشکرا بێ! هەرچی پاکییە دەرکەوێ.

پاش دوو کاتژمێر ئەنجامێکی سەرسوڕهێنەر دەرکەوت لە ئەنجامی پشکنینە پزیشکیەکە داوێن پاکی خالید لەم تاوانە درۆزنە ئاشکرا کرد، خالید لە خۆشیان هیچی پێ نەکرا هەر ئەوە نەبێ چووە کڕنۆشی شوکرانە لەسەر زەوی بۆ خوای گەورە لەسەر ئەوەی کەپاکی بەدیار کەوت و ئەفسەرەکەش داوای لێبوردنی لێکرد لەسەر ئەوەی کە نیگەرانیان کرد بوو، ئەوجا پیرەژن وکچە ناپاکەکەیان بردە بەشی پۆلیس بۆ لێکۆلینەوە لەگەڵیان و جێ بە جێ کردنی فەرمانی پێویست لەگەڵیان ....

خالید سور بوو لەسەر ئەوەی پێش نەخۆشخانە بەجێ بێڵێ

بچیّ خوا حافیزی له پزیشکی پسپۆڕ بکا که به ئیشەکه هەڵستاوه چووه لای له ژووری تایبەتی خۆی بۆ  خوا حافیزی وسوپاسی بکا لەسەر ماندوو بونی ، بەلاّم دکتۆرەکه له ناکاو پێی گوت : ئەگەر ڕێم بدەی دەمەویّ له جێگایەکی تایبەت چەند دەقەیەك بتبینم .
دکتۆرەکه کەمێك تێك چوو پاشان ئازایەتی هێنایه بەر خۆی و گوتی : بەڕاستی کاك خالید لەو پشکنینانەی کردمان لەسەرت گومانم هەیه که نەخۆشیەکت هەیه !!...
بەلاّم لەوه دڵنیانیم لەبەر ئەوه دەمەویّ چەند پشکنینێك لەسەر هاوسەرەکەت ومنداڵەکانت بکەم . خالید بەترس ودڵه ڕاوکیّ لەسەر ڕوخساری گوتی : توخوا دکتۆر پێم بڵیّ هەرچی هەیه ڕازیم بەقەزا وقەدەری خوا بەلاّم گرنگ لەلای من منداڵه ساوایەکانمه من ئامادەم بۆ قوربانی له پێناویان ، ئینجادەستی بەگریان کرد دکتۆر دەستی کرد بەهێورکردنەوەی ودڵنیا کردنی ئینجا پیّ ی گوت : بەڕاستی من ئێستا ناتوانم هیچ شتێکت پیّ بڵێم هەتا دڵنیا نەبم لەکارەکه چونکه ڕەنگه گومانەکانم له جیّ ی خۆی نەبێت وبەلاّم خێراکه خێزانەکەت و هەر سیّ منداڵەکەت بێنه .
پاش چەند سەعاتێکی کەم خالید خێزانەکەیی ومنداڵەکانی

هێنایـە نەخۆشـخانە، ئینجـا دەسـتیان کـرد بەپشـکنینی پێویسـت وئەوانی بردە ناو ئوتۆمبێلەکە هاتەوە تاکەمێك قسە لەگەڵ دکتۆر بکـات کـە پێکـەوە قسـەیان دەکـرد زەنگـی مۆبـایلی خالیـد لێـی دا وەڵامـی دایـەوە دەسـتی بـە قسـەکردن کـرد لەگـەڵ دکتۆرەکـە .
دکتۆرەکـە پـێ ی گـوت : ئـەوە کێیـە دەڵـێ ئەگـەر خـۆت نـەپارێزی دەرگای ماڵەکەت دەشکێنم ؟!!
گوتی : ئەوە (حەمەد)ی برامە لەگەڵمان لـەناو مـاڵ نیشـتەجێ یـە کلیلی شوقەکەمانی بزر کردووە داوام لێـدەکات کـە زوو بچمەوە تـا دەرگـای لێبکەمـەوە ، دکتۆرەکـە بەسەرسـامی گـوتی : ئـەو برایـەت لەکەیەوە لەگەڵتان نیشتە جێ یە ؟!
خالیـد گـوتی : مـاوەی چـوار سـاڵەو ئێسـتا لـە خوێنـدنی کۆتـایی زانکۆیە . دکتۆرەکە پێی گـوت : دەکـرێ ئـەویش بهێنـی بـۆ ئـەوەی هەندێك پشکنینی بۆ بکەین ؟
بۆ ئەوەی دڵنیا بین نەخۆشییە کە زگماکە یان نا ؟!
ئەوجا خالید گوتی : بەدڵخۆشییەوە بەیانی لەلات ئامادەیە !!
لـەکاتی دیـاریکراو خالیـد و حەمـەدی بـرای لـە نەخۆشـخانە ئامـادەبون و پشـکنینی تایبـەتیان لێ وەرگـیرا دکتۆرەکـە داوای لەخالیـد کـرد کـە پـاش یـەك هەفتـە سـەردانی بکـات بـۆ زانینـی

دەرئەنجامی کۆتایی و دڵنیا بون لە هەموو شتێك ..
خالید بە درێژای ئەم هەفتەیە بە پەشۆکاوی و دڵە ڕاوکێ مایەوە .
لەکاتی دیاریکراو هاتەوە لای دکتۆرەکە ئەویش زۆر بەدڵخۆشی پێشوازی کرد ، داوای کوپێك ئاوی لیمۆی کرد بۆ ئەوەی مێشکی هێور ببێتەوە دەستی کرد بەباسی ئارام گرتن لەسەر لێقەومان و نەهامەتیەکان وئەو دنیایە حاڵی هەر ئەوهایە !!
خالید قسەکەی بڕی وگوتی :توخوا دکتۆر لەمە زیاتر مەمسوتێنە من ئامادەم لەسەر هەر نەخۆشییەك خۆم ڕابگرم ئەوە قەزاو قەدەری خوایە بەڕاستی مەسەلە چی یە ؟
دکتۆرەکە کەمێك سەری لەقاند وگوتی : زۆر جار ڕاستی تاڵ وپڕ ئێش و ڕەقە !! بەڵام هەر دەبێ ڕاستی بزانی و بەرەنگاری ببیەوە بەڕاستی هەڵاتن لە بەرەنگار بونەوە گرفت چارە ناکات و ڕاستەقینە ناگۆڕێت ، کەمێك دکتۆرەکە بێ دەنگ بوو..ئەوجا قسەکەی تەقاندەوە گوتی : خالید تۆ نەزۆکی و منداڵت نابێت !!!هەر سێ منداڵەکە لەتۆ نینە بەڵکو ئەوان لە حەمەدی براتن ...خالید توانای بیستنی ئەو ڕوداوە کوشندەی نەکرد قیژاندی بەهاوارێکی گەورە سەدای دایەوە لە نەخۆشخانەکە ئەوجا کەوت و لەهۆش خۆی چوو .

پاش دوو هەفتە خالید لە بێ هۆشیە درێژەکەی بەخەبەر هاتەوە بۆ ئەوەی هەموو شتێك لە ژیانی ببینێ کە سوتاوەو ڕوخاوە خالید توشی نیوە شەلەل وهۆش لە دەستدان بوو لەئەنجامی ئەو هەوالە لە ناکاوە ، هەڵیان گرت بردییانە نەخۆشخانەیەکی عەقڵی هەتا ئەوەی لە ژیانی ماوە لەوێ بێ .

بەلاّم ژنەکەی بردرا بۆ دادگایەکی شەرعی بۆ ئەوەی دان بە ڕاستیەکان دابنێ بەپێی شەرع و دادگایی بکرێ.

بەلاّم حەمەدی برای ئێستا لە ژوورە تاریکەکانی زیندان دایە چاوەڕێی دەرچونی سزای شەرعی خۆی دەکات .

بەلاّم سێ منداڵە کۆسکەوتەکە بردرانە خانەیەکی چاودێری کۆمەلاّیەتی بۆئەوەی لەوێ هەتا هەتایە لەگەڵ منداله بێ نازەکان بژین .

# ناپاکی

پێ دەچێت بە سەرهاتەکەم لاتان نامۆ بێت، من تەمەنم ٢٣ ساڵە لە ساڵی چوارەمی کۆلیجی بازرگانیم هاوسەر دارم ماوەی ٥ ساڵە، ژیانی رابووردوی نزیکم ئاماژەیە بۆ چیایەك لە سەرپێچی و تاوان، شەیدای کچان بووم هەرچەندە خاوەن خێزانیش بووم، بەڵام هەمیشە لەگەل کچان دەردەچووم ورامدەبووارد ، فێری تاوانم دەکردن بەبێ هەست کردن بە گوناح وترسان لەخوا ، لەبیرم چووبوو یان هەرنەمدەزانی کە چی بچێنم ئەوە دەدورمەوە، زۆر ئەو دەستەواژەیەم دەبیست بەلام نرخیم نەدەزانی، رۆژێك لە رۆژان کە چوبومە زانکۆ بەڵام هەستم بە گۆڕانکاریەك لە روخساری خێزانم بەدی کرد، شکم پەیدا کرد ودابەزیم ئەوجا پاش نیو کاتژمێر هاتمەوە، دیتم ژنەکەم بە تەلەفۆن قسە لەگەل گەنجێك دەکات، لە گفتوگۆیەکی دلداری لە هەمان تەلەفۆن کە من قسەم پێ دەکرد، ئەو وتە پیرۆزە گەورە م لەسەر هاتە دی کە دەفەرمووێ: (كما تدين تدان) وەخت بوو بیکوژم ئەگەر خوا رەحمی بە من وئەو نەکردبا.

زۆر بەکوڵ گریام وپاش ماوەیەك چومە ماڵی باوکی بۆ ئەوەی تەلاقی بدەم ،دیتم تەواو گۆڕاوە پێی گوت: کە لەمەو دوا بە

تەواوی خوا دەپەرستیٚ وتی لیٚم خۆش بەو مۆلەتی کۆتایم بدیٚ پاکی بۆ ئەو خوایەی کە وەرچەرخان بەدەست ئەوە ئیٚستاش سوپاس بۆ خوا گەڕاوەتەوەو هەتا ڕوشی دەپۆشیٚ ولە پاکی نیازی هەتا فەرز یان سونەتیٚکی ناچیٚ وبگرە شەو نویٚژیش دەکات ،منیش وەکو ئەو بەوەش بوینە خیٚزانیٚکی لەو پەڕی بەختەوەری و وپەیوەست بەدین وبەلیٚنمان دایە خوا کە قەت نەگەڕیٚنەوە سەر تاوان وسەرپیٚچیەکانمان، سوپاس بۆ خوا، لەبیر نەکەی لەدەرگای خەڵك بدەی لە دەرگات دەدریٚتەوە.

# جگەرگۆشە

پیاو چاکێك گیرۆدەی لەدەست دانی منداڵەکانی ببوو ، هەرجارەی منداڵەکی دەبوو پێی دڵخۆش دەبوو،بەڵام مەرگ هەر زوو دەیبردەوە،بە غەمباری و دڵشکاوی دەیهێشتەوە،بەڵام پیاوەکە لەبەر پتەوی بروای تەنیا دڵی بەخوا خۆشب و ئومێدی بەپاداشتی خودازۆربوو، هەموو جارێك کەمندالی دەمرد دەیگووت: (لله ما أعطى ولله ما أخذ أللهم أجرني من مصيبتي واخلفني خيرا منها)

ئەوەی خوا بیدات یان بیباتەوە هەر ئی خۆیەتی، خوایە گیان پاداشتم بدەوەو لە دوای چاکترم پێ ببەخشە)

هەروا بەردەوام بوو هەتا مندالی سێ یەمی دوای سێ ساڵ ئەویش نەخۆش کەوت ونەخۆشیەکەی گران تر بوو، کەوتە سەر لیواری مردن وباوکە داماوەکەی لە دیاری فرمێسکی دادەباراند... سەرە خەوێك بردیەوە، لە خەونی دیت کە قیامەت دا هات... نەهامەتیەکانی قیامەت دەستی پێکرد وپردی (صراط)ی دیت ئامادە کرابوو، واخەڵکی بەسەری دا تێدەپەرن وکابرا خۆشی دیت والەسەر (صراط) ەو دەیەوی رەت بێ زۆر ترسا رزگار نەبێ، ئەوجا دیتی منداڵەکەی هات پێی گووت: بابە گیان من یارمەتیت دەدەم

ودەستی بەڕۆیشتن کرد، بەڵام ترسا لەوەی نەوك بـە لایـەکی دا دی بکەوێ، لەوێش دیتی منداڵی دووەمی مردووی هـات ودەسـتی گـرت، پیاوەکە بەوە زۆر دڵخۆش بـوو، پـاش ئـەوەی کـەمێك تێپـەری زۆر تینوی بوو، داوای لە منداڵێکی کرد کە ئـاوی بـداتێ، بـەڵام گـووتی: نەخیر ئەگەر یەکێکمان بەرت بدەین دەکەویە ناو ئاگر ئەوجا چـی دەکەی؟

منداڵەکەی دیکە پێ گوت: بابە گیان ئەگەر برای سێیەمان هەبایـە ئەویش بە ئاو فریات دەکەوت هەر ئێستا...!

ئەوجا کابراڵە خەونەکەی بە تـرس ولـەرزەوە خەبـەری بـۆوە، زۆر سوپاسـی خـوای کـرد لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو هێشـتا لـە دونیـا یـەو ژیانی دونیایی لێ دانەبڕاوە، هیشـتا قیامـەت نـەهاتووە، ئـاوڕی داوە لای کورە نەخۆشەکەی دیتی هەناسەی لی بـڕاوەو گیـانی سـپاردووە، هاواری کرد سوپاس بۆ ئەو خوایـەی کـە تـۆی بـۆمن کـردە پاداشـت وتوێشوی دوا رۆژم بـۆ رزگـار کـردنم لەسـەر پـردی(صـراط) مـردن منداڵەکـەی زۆر ئاسـایی بـوو بەلایـەوە ئـەویش لـە ئـەنجامی ئـەو ئارامگری وزیکرە پیرۆزەی کە دەیگوت لە کاتی لێ قەومانداو خواش ئەو راستیەی پێشان دا. مردنەکەشی زۆر بـەلاوە سـادە و سـەلامەت بوو. خوا ئارامیو خۆگری بە ئێمەش ببەخشێ.

# کاریگەری دوعا

سەعات لە چواری بەرە بەیان نزیك دەبۆوە.. هەموو شتێك لە دەورو بەری بێ جولە بوون، بێجگە لە گەڵاکانی دارەکە کە شنە بای شەو دەیلەراندنەوە، گەڵاکانی دارەکە لە نزیکی پەنجەرەکە شۆر ببونەوە بە هێمنی و بێ دەنگی هەموو شتێکیان داپۆشیبوو.. لەناکاو زەنگی ئاگاداری لێدا.. ترررن..ترررن..تررر.. خەدیجە ئەو دەنگە هەراسانەی کپ کردەوە بەخێرایی سەر جێی بە جێ هێشت بەرەو سەر ئاو ..ڕۆیشتنەکەی بەگرانی بوو کە لێڕاهات بوو، لە کۆتایی مانگی هەشتەمینی دوو گیانی دا بوو، سکی گەورە ببوو قاچەکانی ئاوسا بوو.. بەئاسانی ماندوو دەبوو هەناسەی تەنك دەبوو روخساری تێك چوبوو.. چاوی لەبەر گریان کز ببوو .. بەڵام بە ناچاری لەو کاتە هەڵدەستا.. بانگی بەیانی تەنها یەك سەعاتی مابوو!! خەدیجە لە نزیکترین دەستە خوشکەکانم بوو سێ ساڵ بوو مێردی کرد بوو بێ گومان خۆی و مێردەکەی زۆر دڵخۆش بوون بە زگەکەی، بەڵام لەسەردانێکی بۆ لای دکتۆری پسپۆر و باش پشکنینی پێویست دکتۆرەکە پێی گووت: کە کچەکەی ناو سکت تەنها یەك گورچیلەی هەیە!! پاکی بۆ خوا ! نوژدارەکانی رۆژئاوا هەرچەندە لە زانست سەر کەوتوون بەڵام تێبینی هەستی

مرۆڤایتی ناکەن، خەدیجەی بەستەزمان توشی کۆستێکی گەورە بوو کەدکتۆرەکە زۆر بەخوێن ساردی پێی گوت: هیچ چارەسەرێکی خێرا نیە مەگەر پاش لەدایك بوون پشکنینی منداڵەکە بکرێ بۆ دیاری کردنی تاکە گورچیلەکەی ،ئەگەر بارەکە لەبار بوو نەشتەرگەری گورچیلە چاندن ئاسان بووە وەکو نەشتەرگەری قورقوڕاگە !! خەدیجە لە بارێکی شپرزە دکتۆرەی بەجێ هێشت..نەیزانی چۆن گەشتە ماڵێ یەکەم منداڵەو یەك گورچیلەیە! چار چی یە؟ ئایا دەبێت دکتۆرەکە بەهەڵە دا نەچووبێ ؟ خۆی و مێردەکەی دەستیان بە گەڕان کرد بە دوای باشترین نوژداری ئەم بوارە، بەڵام هەموو نوژدارەکان هەمان دەر ئەنجامیان دەدای کە یەك گورچیلەیە لەگەڵ هەر سەر دانێکی بۆ نوژدارەکان ئومێدی کەمترو بێ هێزتر دەبوو لە کۆتایی دا ملکەچی فەرمانەکە بوو کۆتا نوژدار پێی گووت: خۆت ماندوو مەکە بارەکە ناگۆڕێ... لەو کاتەوە خەدیجە تێگەیشت کە هیچ بەدەست خۆی نی یە بێجگە ڕوو لە خوا کردن و پاڕانەوە.. لەوێ رۆژێوە..کەسێ یەکی کۆتای شەو هەستێ و بپاڕێتەوە بۆ کچەکەی کە هێشتا لەسکی بوو، چونکە خوای گەورە لە قورئان دەفەرمووێت

﴿ وَإِذَا سَأَلَكَ عِبَادِي عَنِّي فَإِنِّي قَرِيبٌ أُجِيبُ دَعْوَةَ الدَّاعِ إِذَا

دَعَانِۖ فَلۡيَسۡتَجِيبُواْ لِي وَلۡيُؤۡمِنُواْ بِي لَعَلَّهُمۡ يَرۡشُدُونَ ﴿١٨٦﴾ ﴾ البقرة: ١٨٦

﴿ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يَمۡسَسۡكَ بِخَيۡرٖ فَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ﴿١٧﴾ ﴾ الأنعام: ١٧

﴿ وَإِن يَمۡسَسۡكَ ٱللَّهُ بِضُرّٖ فَلَا كَاشِفَ لَهُۥٓ إِلَّا هُوَۖ وَإِن يُرِدۡكَ بِخَيۡرٖ فَلَا رَآدَّ لِفَضۡلِهِۦۚ يُصِيبُ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦۚ وَهُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٠٧﴾ ﴾ يونس: ١٠٧

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ غافر: ٦٠

وههـروهها لـه فـهرموودی پـیرۆزی خۆشهویسـت ﷺ هاتووهکـه ئـهبوو هـوریره دهیگێرێتـهوه کـه خۆشهویسـت ﷺ دهفـهرمووێت:{**ینـزل ربنـا تبـارك وتعـالی كل ليلـة الـی السماء الـدنيا، حـين يبقـی ثلـث الليـل الاخيـر فيقـول : مـن يـدعونی فأستيجب لـه مـن يسـألونی فأعطيتـه مـن يستغفر فـأغفر لـه**} رواه البخـاری ومسـلم. واتـه: خـوای گـهوره هـهموو شـهوێك دادهبهزێتـه ئاسمـانی دونيـا ، کـه سێ يـهکی کۆتـايی شـهو دهمێنـێ دهفهرمووێ:{کێ بـانگم دهکا وهلامـی بدهمـهوه ، کێ داوام لێ دهکا بيدهمێ، کێ تـهوبه دهکات لێی خۆش بم}.

خەدیجە بۆی دەرکەوت کە هیچ پەنا گەیەك نیە تەنها خوا نـەبێت بۆیــە دوو دڵ نــەبوو لــە هەســتانەوەی هــەموو شــەوێك پــێش بەرەبــەیان بـە سـەعاتێك یـان زیـاتر هـەر چـەندە هـیلاك بـوو لـە دەست سکی و بێ خەوی :هەموو شەوێك لە سێیەکی کۆتـایی شـەو دەچووە سەر بەرماڵ و لەنوێژەکانی کرنۆشی ملکەچی دەبردوو لـە خوا دەنوزاییەوە کەکچێکی لەش ساغ و بەجووت کلییەی بداتێ!!
زۆر سور بوو لەسـەر داواکـەیی و دەگریـا تابەرماڵەکـەی تـەڕدەکرد، قەد ڕۆژێك بێئومێد نـەدەبوو..لاواز ببـوو ڕکـوع وکرنـۆش لەبـەری یەکجار گران بوون، بەڵام وازی نەدەهێناو بۆجـارێکیش کـۆڵی نـەدا هەر چەند جاری سەردانی نوژداری دەکرد ولەگەڵ هەر پشکنینێك هــەمان ئــەنجامیان پــێ دەدا خەدیجــە زیــاتر ســوربوو لەســەر شـەونخونی و پاڕانـەوەی کۆتـای شەوەهاوسـەرەکەی دڵـی پـێ سـوتا لەبەر زۆر شەونخونی ترسا لێی کـە توشـی گرفتێـك ببێـت لـەکاتی بونی کچەکە بەتاکە گورچیلەیەکی، هەردەم بەبیری دەهێنایەوە کە خوای گەورە وەڵام دانەوە دوا دەخـات ئـەم فـەرمودەی پێغەمبـەری ﷺ بۆ دەهێنایەوە: (مامن مسلم یدعو بدعوة لیس فیها اثم ولا قطـع رحـم الا اعطـاه الله بهـا احـدی الثلاث:امـا ان تجعـل لـه دعوته، واما ان یدخرها له فی اخرة، واما ان یصرف عنه من سو مثلها قالوا اذا انکثر قال الله اکثر)الترمذی:٣٦٠٤
واتە: هەر موسڵمانێك بپاڕێتەوە کەخراپەو پەیوەندی پچڕانی تێدا

نەبێت ئەوە هەر خوای گەورە بۆی جێبەجێ دەكات بەیەكێك لەم سێیە: یان داواكەی پێش دەخات، یان دوای دەخات بۆ قیامەت، یان خراپەیەكی لەسەرلادەبات،گوتیان: ئەگەر زیاتر داوا بكەین.پێغەمبەر فەرموی: خواش زیاترە.

هاوسەرەكەی بەبیری دەهێنایەوە كەوا هیچ چارەیەك نیە مەگەر هەرلەخوا داوابكات، ئەگەر لەو داوا نەكات لەكێ داوا دەكات؟؟!!

ئادەمیزاد هیچ شتێك داواناكات

بۆچی داواناكەی لەو خوایەی كەدەرگای داناخات

ئەگەر لەخوا داوا نەكەی تورە دەبێ

ئەگەر لە غەیری خواداوا بكەی پشتت تێ دەكات

چۆن داواناكەی لەخوا كەخۆشەویست ﷺ لە فەرمودەیەكی قودسی لەخزمەت خوا دەگێڕێتەوە:(ئەی بەندەكانم ئەگەر سەرەتایی وكۆتایتان مرۆڤو جنۆكەتان لەیەك كاتدا لێم بپاڕێنەوە بۆ هەر یەكێكیان داخوازی جێ بە جێ دەكەم بەوەش هیچ لەوەی لەلامە كەم نابێتەوە مەگەر بەقەد دەرزییەك كە لەدەریایەك بنرێ) لەگێڕانەوەی موسلیم

پێش كاتی دیاریكراوی لەدایك بوونەكە كەدوو هەفتە مابوو خەدیجە سەردانی كردم كاتی نوێژی نیوەڕۆ بوو پێكەوە نوێژمان كرد پێش هەستانمان خەدیجە دەستی گرتم وپێی گوتم:هەست

بەختوكەیـەكی نـامۆ دەكـەم . پـێم گـوت: هەسـت بـەهیچ ئـازار دەكـەی؟ گوتی:نـەخێر. بـەڵام بـۆ دڵنیـا بونمـان پەیوەنـدیمان بەدكتۆرێك كرد، ئەویش گوتی: وەرنە لام.

هەوڵماندا پەیوەنـدی بـەمێردی خەدیجـەوە بكـەین بـەڵام بـێ سـود بـوو چـونكە لەنوێـژی هـەینی بوو.پشـت بـەخوا چـوینە نەخۆشخانەكە سەرمان سوڕما كەگوتیان لەحاڵەتی منداڵ بوونـە !! لەتەنیشتی دانیشتم ویارمەتیم دا...سوپاس بۆ خـوا زۆردەم بـەنزا بـوو هەرچـەندە ئـازاری زۆر بـوو بـەڵام هـەر لـەخوا دەپاڕاییـەوە كەكچێكی لەش ساغ ودوو گورچیلەی پێ بـدات!! فاتمـە لـەدایك بوو قەبارەی بچوك بوو..ڕووخساری ووردبـوو..ڕووی مەیلـەو شـین بوو..لەلاپشـتی كەلاكـەی مـاكێكی بچـوك بەرانبـەر گورچـیلەی هەبوو، وەكو ئەوەی كە جەسـتە بچوكەكەی گورچـیلە نەبووەكـەی مژی بێ.

گریـام و خەدیجـە گریـا لـەناو فرمێسـكەكانی لـەباری كچـەكەی دەپرسی ..بەچی وەڵام بدەمـەوە؟!چ بـەو دایكـە بڵێم لەشـەونخونی كەچاوی بەگریان ووشك ببو وهێشتا ژانی لێیە؟!(ماشاء الله )جوانە ویستم قسەیەكی تر بكەم بەڵام قورگم گیرا، پـاكی بـۆ خـوا چـەند دەقەیەكی نەبرد ڕەنگە شینەكەی بەرەو ڕەنگی پەمەی گۆڕا لەدەم وچـاوی فاتمـە ووردبوومـەوە..پاكی بـۆ بەدیهێنـەر ..ڕووخسـاری

جوانە هەرچەند سەیرم دەکرد ئەو گرفتەم بەبیر دەهاتەوە کە بەهۆی یەك گورچیلەیی توشی دەبێ من وخەدیجە بەیەکەوە بێدەنگ بووین و بیرمان دەکردەوە داخۆ ئەنجامی کچۆڵەیەکی تاکە گورچیلە چۆن بێ؟!!
نوژدارەکانی منداڵان هاتن ودوا پشکنینیان بۆ کرد گوتیان پێ دەچێ سروشتیە بەڵام دەبێ پشکنینی ووردی بۆ بکرێ بۆ زانینی توانای گورچیلەکەی و ئەوەش ناکرێ هەتا دووهەفتەی دیکە، خەدیجە زۆر دوودڵ بوو لەسەر بردنی فاتمەی ساوا بۆ پشکنینی ووردکاری، ڕۆژێك پێی گوتم:(قەزاو قەدەری خوا چۆن بێ هەرئاوادەبێ پێویست ناکا جەستە لاوازەکەی بەم پشکنینانە هیلاك بکەن). بەڵام دەستی لەهۆکارەکان بەرنەداو بریاری دا پشکنینەکانی بۆبکا ڕۆژی دیاریکراو هاتوو چووین لەپرسگەی چاوەڕوانی لەچاوەڕێی دەرچونی نوژدارەکە بووین کەبێتە دەرێ لەبارەی تاکە گورچیلەکە هەواڵمان بداتێ..داخوا فاتمە پێویستی بەگورچیلەیەکی تازە هەیە یان تاکە گورچیلەکەی خۆی ئاخۆ دەتوانی کاری دوو گورچیلە بکات؟؟!! نوژدارەکە بەزەردەخەنەیەکی درێژ هاتە دەرەوە ڕووی لێمان کردوو گوتی: نازانم چی بڵێم ونازانم چی ڕوویداوە!!بەڵام کچەکەت بەتەندروستیەکی باشەوە بەدوو گورچیلەوە؟ گاڵتەت بەپاڕانەوە

دێت ئایا نـازانی پاڕانـەوە چی کرد؟؟دەرئـەنجامی پاڕانـەوە چـەند جوانەو خوا چەند بەخشندەیە بۆ خەڵکی!!ئێستاش فاتمە تەمـەنی پێنج ساڵانە...خوا پاراستی کردییە سۆمای چاوی دایکی وباوکی.

## پیشەنگی

لەسەر هەمووومان پێویستە خۆمان شارەزا کەین لە ژیانی هاوسەرێتی ڕاستەقینە، چۆنە؟ وە چۆن بەختەوەر دەبین ؟

جا بۆیە پێویستە لەسەرمان کە چاو لە چاکترین وخۆشە وسترین کەسی خۆشەویستی خوا بکەین ئەویش سەروەرمان (محمد)ە (ﷺ) کە خوا دەربارەی فەرموویەتی:- (وانك لعلى خلق عظيم)

واتە:- ئەی محمدﷺتۆ لەسەر ڕەوشتێکی زۆر بەرز و جوانی.

لەبەر ئەوە وا چەند نموونەیەکی لەسەر ژیانی هاوسەرێتی ئەم نازدارە لەگەڵ خێزانەکانی دا دەخەینە ڕوو:-

ئەم نازدارە نە دەنوست ومەگەر هەردەبا سیواکی بکردبایەو لەکاتی لە خەو هەستانیش سیواکی بەکاردەهێناو لە دەمی وەردەدا.

خۆشەویست (ﷺ) بۆن وبەرامی بەکاردەهێنا تا بۆندارتربێ

هەروەها سەرو پرچی ڕێك دەخست وچەوری دەكرد وهەروەها ڕیشی پیرۆزی بە ئاو وشانە دادەهێنا بۆ ئەوەی جوانترین سەرو سیما بێ.

لەو كاتەی دایكە عائیشە (ڕەزای خوای لەسەر بێ) لە سووری مانگانەدا بووە نازدارمان هەر لەگەڵی دا نوستووە، وهەروەها لە دەفرێك پێكەوە خۆیان دەشوشت هەریەكەیان دەیگوت بۆمن لێگەڕێ وبەم جۆرەش زیاتر پەیوەندییان گەرم وگوڕتر دەكرد وجۆشیان دەدا.

نازدارمان زۆر بە سۆز ونەرم نیانی هەڵسوكەوتی لەگەڵ خێزانی عائیشە (ﷺ) دەكرد لە بیری بوو لە خۆشەویستی وبەزەیی وسۆزو دڵنەوایی، هەروەها لەو جێگایەی كە ئەو لێوی لەسەر دادەنا وئاوی دەخواردەوە ئەویش لەوێ دەیخواردەوە، وبە جلی خۆی دەیسڕیەوە وڕوومەتی پیرۆزی خۆی لەسەر ڕوومەتی دادەناو، سەری بەسەرینی ئەو دەكرد.

ئەو پێغەمبەرە لەبەر زۆر خۆشەویستی وڕێزگرتنی دایكمان عائیشە (ﷺ) زۆر جار گەمەو گاڵتەی لەگەڵ دا دەكرد وجار هەبووە پێشبڕكێی لەگەڵ دا كردووە، لەسەر شانی خۆی هەڵیگرتووە لە كاتی جەژن دا، هەروەها بە جەستەی پیرۆزی خۆی شان وباڵی بۆ خۆشی پاڵیان پێكەوە ناوە سوحبە تیان كردووە

وڕایان بواردووە،بە جوانترین شێوازو ونەرم ونیانترین دەستەگەمە و هەڵسوکەوتیان کردووە.

هەروەها لە خۆشەویستی وسۆزی بەنازناوی (یا عائش) واتە:ئەی زیندوو یان بە نازناوی (یا حومەیرا) واتە (سوورکەڵە) بانگی کردووە کە نیشانەی پێ جوانی وسەرسام بوونی بووە.

هەروەها قەت ئازاری نەداوە، لە کاتی کاردکردندا یارمەتی کردووە ولە کاتی نەخۆشی دا نزای بۆ کردووە وهەستی بریندار نەکردووە، هەروەها لە کاتی نوستندا زۆر بە نەرم ونیانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دا کردووە تاکو نەترسێ وڕانەچڵەکێ، هەروەها ئەگەرخواردنێکی بخواردبا یان شلەیەکی بخواردبایەوە بۆ عائیشەشی دەنارد،زۆر بەووردی چاودێری دەکردولەجووڵەو ئاماژەکانی تێدەگەیشت ودەیخوێندەوەو هەست وسۆزی دەخوێندەوە وهەروەها عائیشەش بەرانبەری وابوو، هەریەکەیان ئەگەر داخوازییەك یان پێداویستیەکی هەبا یەکسەر تێدەگەیشت وبۆی جێ بەجێ دەکردودەگەیشتە فریای ،وە دڵی خۆش دەکرد.

نـازدار ( ﷺ ) زۆر بـە پەرۆشـەوە چـاودێری دەکـرد لـە کـارو گوفتاری داو پێی دەگووت (ئەی عائیشە مـن دەزانم کـەی لـێم ڕازی یانیش لێم تووڕەی) عائیشەش دەیگوت:- چۆن دەزانی؟!

دەیفەرموو:- ئەگەر لێم ڕازی بی دەڵێی (لا ورب محمد) نەخێر بە خوای محمد وئەگەریش لێم تووڕە بی دەڵێی (لا ورب ابراهیم) نەخێر بەخوای ئیبراهیم پێکەنی و ووتی بەڵێ ڕاستە ئەی پێغەمبەری خودا (ﷺ) جیدی بێجگە لە ناوی تۆ ناهێنم.

ئەمەش نیشانەی ئەو پەڕی ڕەوشت جوانی وژنایەتیە بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) جا ئەگەر تووڕە ببا پێغەمبەر (ﷺ) وازی لێنە دەهێنا هەتا پێنە کەنی با عائیشە ، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر خۆشەویستی وبەسۆز ودڵسۆزی وپەرۆشی وبۆ هاوسەرێتی وهاوسەری ژیانی بەختەوەری.

هەروەها زۆر بە گوفتاری شیرین بە عائیشەی دەفەرموو:- (یا عائشة انة لیهون علی الموت انی رایتك زوجتی فی الجنة)

ئەی عائیشە ئەوە مردن لەسەرم ئاسان دەکات کە تۆم دیت هاوسەرم بووی لە بەهەشتدا. هەروەها ئێمە دەمانەوێ بگەڕێینەوە سەر ژیاننامەی ئەم پێشەنگە کە چۆن هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو خێزانەکانی دا کردووە، وبە تایبەتی لەگەڵ عائیشەدا ئەوجا بەڕاستی ئەگەر بە ژن وپیاوانمانەوە سەرنجی ژیانی پێغەمبەرمان (ﷺ) بدەین لە گەڵ خێزانەکانیدا وە بکەینە پێشەنگ ووچاوی لێ بکەین ئەوە بەڕاستی کۆمەڵگەکەمان ئاسوودە دەبێت وسۆزو خۆشویستی ومیهرەبانی لە هەموو ماڵێکدا دەشەکێتەوە،

بەختــەوەری هــەتا ئەوپــەڕی دێتــە دی، بەســەرهات وچــەند نمونـەیەکی چاکی نوێ لەسەر ژیانی هاوسەرێتی:-

## ئەوین وپێکەوە ژیان

ژنێك منداڵی نابێ ودڵنیا بووە لەوە وزۆر مێردەکەی خۆی خۆشدەوێ، داوای لێکرد کە ژنێك بێنێ تاکو منداڵەکانی ببینێ بەلکو بۆی بەخێویان بکات...... پاش دووساڵ لە گفتوگۆدا وای لە ژنەکەی کرد کە ژنێکی بۆ بخوازێ کە پێی بحەسێتەوە، بـۆ ئـەوەی پێکەوە بژین، چونکە ناتوانێ ماڵێکی سەر بەخۆی بۆ دابنێ.

ژنێکیان هەڵبژارد ودیندار وجوان بـوو، پێـنج منـداڵیان بـوو، هـەر هەمویان سەرکەوتوو بوون لە زانست ورەوشـت (دکتـۆر، ئەنـدازیار، دووبازرگـان، دەرچووی زانسـتی)هەموویان بـەزڕ داکیـان دەگـووت: دایــە. دایکـی خۆیــان مــردوو دایکــی دووەمیــان لــە پــەروەردەیان بەردەوام بوو لەو پەڕی بەختەوەری دەژیان.

باوکەکەش کۆچی کردوو دایکیان کە زڕە هەتا ئێستاش لەگەڵ دابێ پاش هاوسەرگیریشیان هەر ماڵە گـەورەی هەمووڕۆڵەکانـە، دێنـەوە لە لای زڕ دایکیان کۆدەبنەوە.

ئەمەش نمونەیەکی زۆر خۆشە لەسەر خۆشەویستی وپێکەوە ژیان، هەرهەموومنداڵەکان لە هاوسەرێتیان سەرکەوتوونە وێرای منداڵەکانیان.

## زەماوەندێکی سادە

لەسەر بناغەی دینداری هەردوولا پێك ڕازی بوون ماڵی بابی بوکەکەش ڕازی بوون بیدەنێ. ماڵی بوکەکە داوایان کرد دوای دوو هەفتە زەماوەند بگێڕدرێ بەڵام مێردەکە ڕەتی کردەوە گوتی:- ڕازیم بەڵام بە مەرجێ بەبێ بارقورس کردن وماڵی بابی بوکەکە بێجگە لە جل وبەرگ داوای چیدی نەکەن.

زەماوەندەکە بە هەفتەیەك گێڕدراو بوك و زاوا چوونە شوقەیەکی سادەو بە بێ تەنتەنە، نیشانی بوك تەنها جل وبەرگی بوکێنی بوو وبەس ژیانیان بە خۆشەویستی وقوربانی وسادەیی دەستی پێکرد، بەتەنها خەرجی (١٢٠) جونەیهی، بەڵام پیت وفەڕێکی بێ هەژمار ئەنجامەکەی بوو.

هەروەها سەرەتا هەژار بوون، بەلام حاڵیان بە فەزڵی خوا گۆڕاو دەوڵەمەند بوون هەتا ئێستاش پازدە ساڵە هیچ گیرو گرفتێکیان

نەبووە وبە فەزڵی خوا ئەم ماڵە هەر هەموویان بانگ خوازی بۆ دینی خوا دەکەن. تێبینی:

چاك هەڵبژاردن وئاسانکاری هاوسەرگیری بەرەکەت وخۆشەویستی بۆ ئایینی خوا ومیهرەبانی لە هۆکارەکانی سەرکەوتی ژیانە.

## هەرکەسێك بە نیازی خۆی

کورێکی دیندار کچێکی هەڵبژارد لەبەر دینداری، هەرچەندە ماڵەکە زۆر شەکەت وهەژارو وپەرپوت بوون، بەلاَم نیازی زاوا دەربازی کردنی کچەکە بوو لە و مەینەتییە پاش ئارام گرتن و رەنج دانێکی زۆر خواستی.

سەرکە وتوو بوون کەس یارمەتی نەدان لە هاوسەرگیریەکە دا، مێردەکە زۆر سادە بوو بەلاَم زۆر رەنجدەر بوو لە رێگای بانگخوازی و خۆبەخشی و خۆنەویستی .

ژیانیان زۆر خۆش بوو بەبێ گیرو گرفتی گەورە، بە کاسبی خۆی سەرپەرشتیاری ماڵەکەی دەکرد ، چەند منداڵێکیشیان بوو.

بەرەبەرە پیاوەکە لە پیشەکەی سەرکەوتوو بوو تا گەیشتە (ئوتومبیل – نورینگەوحەج وعومرە) ماشا اللە هەتا ئێستاش

لـەناو خێـرو پیـت وفـەڕدان، خـوا بـەردەوامیان کـات لەسـەر بەختەوەری لەگەڵ ئێمەش لە هەردوو جیهاندا.

## ئارامگرتن ومتمانە بە خوا بوون

خێزانێك تەنها لە ژن ومێردێکدا پێك دێت ودوای ماوەیـەکی درێـژ خوا هیچ منداڵێکی پێ نەبەخشین وباری ئابووریشیان باش نـی یـە ، بـەلاَم زۆر بـە خۆشـی وهێمنـی ئاسـوودەی دەژیـن، ئـەویش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەو دینـداری ورەوشـت بەرزییـەی کـە ژن ومێردەکە هەیانە، هەروەها گوێ نەدانـە قسەی ئەم وئـەو بـڕوای تەواویان بە قسمەت ودابەشکردنی خـوا هەیـە لـە بـژێوی ومنـداڵ بـوون وچاك دەزانـن ئەگـەر خـوا حـەز بکات منـداڵ دان لای خـوا ئەستەم نیە.

## ئەستێرەیەكی بەناوبانگ ئیلیزابیت تایلور

نمونەیەكی ڕۆژئاوا:- بەسەر هاتی هاوسەرگیری سەرنەكەوتوو:
ئیلیزا بیت تایلور لە ساڵی (١٩٣٢) لە لەندەن لە دایك بووە، دایك وباوكەكەی بەریتانی بوون پاش هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم بەرەو لۆس ئەنجیلۆس كۆچیان كردووە لە ناوەڕاستی شەستەكان لیز شاژنی هۆلیۆد بووە ، سەرەڕای ئەوەی كە ئەم ژنە بە جوانترین ئافرەت لە جیهان دا ناوبانگی دەركردبوو، بەڵام بە زنجیرەیەك سەرنەكەوتن ژیاوە، هەر بە منداڵی شووی بە (نیك) كرد كە خاوەن هۆتێلات بوو، دوای شووی بە هونەرمەند (مایكل ولدنج) كرد كە نۆ ساڵ لەو گەورەتر بووە ،دوو منداڵیان بوو.
پاشان ئەم ژنە بووە (یەهودی)جولەكە، وشووی بە( مایك تود) كرد ئەویش لەناو فرۆكە سووتا.
هەروەها دووجار مێردی بە ئەستێرە ئەلویزی كردووە، پاش تەڵاق دانی لە فیشەو،دیسان دەستی بە دڵداری كردووە لەگەڵ هونەرمەندی ئەلویزی (ڕیچارد بیچارد) ئەوەش لە كاتی ئامادەكردنی فیلمی (كیلۆپاترا) پێكەوە، كە بووە بەناوبانگترین هاوسەرگیری لە ناو هونەرمەنداندا ئەمەش لە ساڵەكانی

شەستەکاندا بوو.

لە ساڵی (٧٦) بەیەکجاری لـە بـیرت جودابـۆوە، چونکە  پێکـەوەیان لەهونــەردا بــووە هــۆی پشــێوی پەیوەنــدی هاوســەرییان، جــوودا بوونــەوە بــەلام دیسـان دووبـارە هاورســەرگیریان کــردەوە بــەڵام لــە ساڵی (١٩٧٦) بەیەکجاری دەستیان لێك هەڵگرت.

لەو کاتەدابوو کە لیزا بە چەندان خەلاتی ئۆسکار خەڵات دەکرا لـە سـینەما و تەلـەفزیۆن هەشـتـەمین مێـردی (فـۆر شـنکی) بـووە کـە کاریگەرێکی بیناسازی بووە لە داستانی هۆلیوددا، هـەروەها مێـردی نۆیـەمی لـە ژیـانی دا (جـۆن واتــەر) بـووە کـە سیاســەتمەدارێکی ئەمریکی بوو  لەم مێردەش کۆتاییەکەی تەلاقدان بوو.

 لە سالانی شەستەکان تووشی مادده کحولیەکان بووپێوەی ئـالوودە بوو ، بۆیە کەوتە نەخۆشخانە.

بەڵێ هەندێك کەس ژیانیـان ئەوهایـە ئـەوجا هەنـدێك لـە گـەنجان دەیانەوێ بیانکەنە پێشەنگی خۆیان کە لە ڕۆڵەکانی سینەما دەیان بینن وخەونیان پێوە دەبینن ودەیانەوێ بە هاوسەری ژیانی خۆیان بیانبینن، بەلام دوو شتن لـە نێـوان خـەیاڵو ڕاسـتەقینەدا، جـا ئـەم کەسانەحەقیقەتەکەی ژیانیـان  کۆتاییـەکی پڕئـازار بووە. یـانیش خۆ لـەناو بـردن یـاخود ئـالوودە بـوون بـە تریـاك وبـە سەرخۆشی

دەژین ودەمرن تەنها لە پێناوی چرکەیەك لە ژیانیان بە ئاسودەیی وبەختــەوەری خۆزگــە دەخـوازن، بــەلاَم خەلکینــە بەختــەوەری ڕاستەقینە بەبێ خواناسی وچاکەکاری گەلێك دوورە.
کەواتــە ئایـا ئـەو بەختەوەریــەی کـە مرۆڤـی هۆشمەنـد بــەدوای دا دەگــەڕێ؟ ئایـا لــەم ناوبــانگ ودەولەمەندییانــە دەســت کــەوتووە؟ ئەگــەر بەختــەوەرن بۆچـی زۆربــەیان خۆیـان لەناودەبــەن یـانیش تووشـی مـاددە هۆشـبەرەکان دەبن،وهەنـدێکیان تووشـی گۆشـەگیری وخەمۆکی ودوورە پەرێزی کۆمەلگا دەبن وژیانی ئاوارەیی ونامۆیی هەلدەبژێرن.

## چەند بەسەرهاتێکی نالەباری هاوسەران :-

### تێکەلاوی زیادەڕەوی

ژن وپیاوێـــك پێـــك ڕازی بـــوون بەخۆشەویســـتی وقەناعەتـــەوە هاوسـەرگیری بکـەن، پـازدە سـاڵ پێکـەوە ژیـان، خـوا هـیچ منـداڵی نەدانێ، زۆر بە بەختەوەری دەژیان بـەلاّم بـە تێکەلاّو بونیـان بـە هەنـدێك بـرادەر لـە هاوینـە هەوارەکانـدا، هەنـدێك گیروگرفـت تووشیان هات، ژنەکە تووشـی برادەرێـك هـات کـە زۆر قسـە لـووس وبـــەلێزانی وفێڵبـــازی لەگـــەڵی دا دەجولاّیـــەوە، لەوێـــدا گیروگرفتـەکانیان سـەری هەڵـدا کـە ژنەکـە وا تێگەیـەنرا کـە مێردەکەی خۆی بایەخی پێنـادات وفەرامۆشـی دەکـات، وای دەزانـی ئەو کەسە دەتوانێ بەختەوەری بکات وبە مێردی خۆی وا ناکرێ.

لێرەدا وورده وورده گرفـت دەسـتی پـێ کـردو نـارەزایی زۆر بـوون، وتـاکو ناخۆشـیەکە گەیشـتە تـەلاّق، هەرچـەندە پێشـتر ئەوانـە بـە نمونە باس دەکران لە خۆشەویستی وسۆزداری دا.

پاش ماوەیەك ژنەکە مێردی بە کابراکە کرد کـە منـداڵی لـە زانکـۆ بوون ومنداڵی زۆر بوو ئەم ژنـە بـە گرفتـارە مـاوەی مانگێکـك بـە بەختـــەوەری دەژیـــان، ئـــەوجا گیروگرفـــت لەگـــەڵ منداڵـــەکانی مێردەکەی دەستی پێکرد، کە بە نارێکی هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئـەو

زڕدایکە دا دەکرد، خەونە سەوزەکانی گۆڕان بەرەو ناڵەو کێشە وئازاری خێزانی، پاش ساڵێك لە چەرمەسەری لەگەڵ مێردی دووەمی جودابوونەوە، ئێستاش بێوەژنەو بەبێ منداڵ، هەموو شتێکی لە دەست چوو بە کەسوکاریشەوە، چونکە مێردی یەکەمیان زۆر خۆشی دەویست کە نمونەی نەبوو لە پیاوەتی.

ئەو پەندانەی لەم بەسەر هاتە فێری دەبین:- زۆر تێکەڵاوی بێگانە زۆر ماڵان کاول دەکات،ڕازی بوون بە حاڵی خۆت چاکترین ڕێگایە بۆ بەختەوەربوون،ئارامگرتن تالە بۆ مرۆڤ بەلام ئامانجەکانی دەستەبەر دەکات وبەرەکەی شیرینە، بە هەڵە هەڵبژاردنی هاوسەر کارەسات ڕوودەدات.

## بەهۆی بۆنی ناخۆشی "دەم" گیرو گرفت ڕوودەدات

گیرو گرفتێك لەماڵێكی دیندار هەمیشە دووبارە دەبۆوە،...هەر شەش مانگ جارێك ،دووبارە كێشە ڕووی دەدا،بەلاّم هەر جارێك بە جۆرێك پێكیان دەهێناوە....بەلاّم دووبارە ژن ومێردەكە دەكەوتنەوە كێشەوگرفت وشكایەتیان دەكردەوە....پاش ماوەیەك لە نزیك بوونەوە، كەدەستە خوشكێكی ژنە كە پرسیاری لێ كردروون بووە هۆی ئەم گیرو گرفتە كە ئاشكرا بوو،بۆنی دەمی مێردەكە زۆر ناخۆش بووە، ژنەكە پێ ی بێزار بوو خەریك دەبووبرشێتەوە بۆیە لەبەری هەڵدەهات وگلەیی دەكرد وقەدەغەی دەكرد لە خۆی ،كە ئەمە زانرا چارەسەری مێردەكە كرا بە نۆشداری ،پاش ئەمە هیچ گیروگرفتێك نەما ولەوەتی نۆ ساڵە وسوپاس بۆ خودا بە ژیانێكی بەختەوەر پێكەوە دەژین.

تێبینی:چارەسەر كردنی ڕاستەقینەی گیرو گرفت بەوە دەبێ كەواچارەسەری بنەرەتی هۆكاری دروست بوونی گیرو گرفتە كە بكرێ وبنەبڕ بكرێ.

## هەڵسوکەوتی ژنێکی هەوێدار

کابرایەك بەبێ ئاگاداری ژنی یەکەمی کە پەیوەندیان پێکەوە باش بوون ژنی دوومی بەسەر هێنا وژنە تازەکە ژنێکی زۆر سادە وساکاربوو..پیاوەکەش زۆر بایەخی بەژنی تازەی دەدا گوایە مافێکی سروشتی وشەرعی خۆیەتی،جا بۆ ئەوەی هۆگری بێ پێویست بوو لەسەری سوکنایی وخۆشەویستی وهاونشینی بۆ دابین بکا ، لەگەڵ منداڵە کانیشدا،...ئەوجاژنی یەکەمی کەزانی مێردەکەی لە دەست دەرچووە ناچار لێی نزیك دەبێتەوەو سۆزو خۆشەویستی بۆی دەستە بەردەکا گۆرانکاری لەژیانی هاوسەری خۆیدا دەکات، ژنەکە زۆر هۆشمەندو پابەند بوو،مامۆستا بوو منداڵی کوڕو کچی گەورەشی هەبووزانی مێردەکەی چی دەوێ .ئەنجامەکەی: ژنی یەکەم توانی مێردەکە بە خۆشەویستی بۆخۆی مێردەکەی بباتەوە...ژنی دووەمیش رووی ڕاستەقینەی بۆ کابرا دەرکەوت، کەزۆرداخوازی زۆربوو وبەفیز ولوتبەرز بوو هەمیشەنارازی بوو بەوەش ڕاستی نێوان پابەندی و دینداری ژنی یەکەم وژنی دووەم دەرکەت ڕاستیەکان ئاشکرابوون وژنی یەکەم بە لێ زانی وخۆشەویستی خۆی توانی خۆشەویستی مێردەکەی بباتەوە و بۆخۆی مسۆگەری بکاتەوە.

## بەهەڵەتێگەیشتنی لەسەرپەرشتیاری

کچێك مێردی بەکەسێکی ڕێك و پێك و بە ناودیندار کرد...لە ئاکامدا دەرکەوت کە ئەم پیاوە هیچ لە دینداری نەدەزانی، بەرانبەر مافی ژنەکەی تەنها ئەم فەرموودەیەی بیستووە کە دەفەرمووێ:(لَوْ اُمِرْتُ اَحَداً اَنْ یَسْجُدَ لِاَحَدٍ لَاَمِرْتُ الزَّوْجَةَ اَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِها).

واتە:ئەگەر فرمانم بە کەسێك بکردبایە سوجدە بۆ کەسێك ببات،ئەوە فرمانم بە ژن دەکرد کە سوجدە بۆ مێردەکەی ببات.

وای دەزانی کە ژن کۆیلەیە،و ژن هیچ مافی ڕا دەربڕین و داواکاری نیە بۆیە لەسەر هەموو هەڵەیەکی لێرەدا لە شەش مانگی سەرەتایی هاوسەرگیریاندا کەس نەماندەزانی تەنها ئەگەر ژنەکە بەدەم و چاوی لێدراوی بهاتایە دەرێ ،دەرئەنجام لێك جودا بوونەوە هەرچەندە منداڵێکشیان هەبووە هەروەها ژنەکەش توشی نەخۆشی گرێ ی دەروونی بوو بەرانبەر هاوسەرگیری، هەروەها بڕوای نەمابوو بەهیچ کەسێك کەباسی دینداری بکات،گەیشتبووە بڕوایەك کە هەموو دیندارێك وەکو مێردەکەی دەر دەچێت.

چارەسەری چیە؟؟؟ دەستمانکرد بە دانیشتن و گفتوگۆ لەگەڵ ئەو ژنە کە دڵنیا بکرێ ئەم ئەزموونەی ئەو سەرکەوتوو نەبووە،بەڵام هەزاران ئەزموونی سەرکەوتوش هەر هەبووە....

هـەروەها بـاس لـەوەكرا كـەوا گرفـت هـەبووە و چارەسـەریش هەبووە...پاشان ڕازی كرا كەوا زۆر كەس هەبووە پاش تەڵاقدانیش دووبـارە هاوسـەرگیری تـازەی كردۆتـەوە و خـوداش سـەركەوتووی كـردوون، دوای ئـەوە چـەندان منداڵیشـی بـووە وبـە ژیـانێكی خۆشترژیاوە لە پێشتر ئەویش بەنیازپاكی و پشت بەستان بە خوا ، پاش ماوەیەك ژنەكە ڕازی بوو شوو بكاتەوە ، جا كابرایـەك هاتـە داخوازی و ئەویش گوتی مۆڵەتم بدێ با بیری لێ بكەمەوە..سوپاس بۆخوا پێك شاد بوون.

## هەڵبژاردنی بە هەڵە

کەسێك بە هەڵبژاردنی هاوسەر بەهەڵە تووشی هاوسەرگیریەك بوو پێنج ساڵ لەناو گرفتاری دا ژیا ، لەبەر ئەوە باکی نەبوو وبێ منەت بوو کە جوداش ببێتەوە وتەلاق بدرێ ،چونکە خۆشی لەو کەسە نەدیتبوو، پاشان بەسەردا منداڵێکیان بوو قورەکە خەستر بوو، جا منداڵی دووەمیشیان بەسەر دا بوو کارەکە گەیشتە رێگایەکی داخراو بۆ تەلاقدان.

ئێمەش رامان وابوو کە جودا ببێتەوە سەرەڕایی زەرەری پارە و سامانیش،بەلاّم تاکە چارەسەر بوو وەلاّمەکەی ژنەکە رازی بوو کە منداڵەکانیش ببات لەپاشان کەمێردێکی تری کردەوە بەختەوەر بوو لە گەڵیدا. هەروەها کابراش ژنێکی دیندار و جوانی خواست و کورێکیان بوو،خواش بەوە قەرەبووی هەردوولای کردەوە بەختەوەری کەوتە نێوانیان و هەموو فەزلێکیش هەر بەدەست خوایەسوپاس هەر بۆ ئەوە.

# هەڵەی پێش زەماوەند

کابرایەك کچی خاڵی خۆی خواست و پێشتر هەردووکیان ڕازی بوون کە هاوسەرێگیری بکەن، بەلام هەردووکیان بە ئایین پابەند نەبوون ،بەنارێکی رەفتاریان دەکرد لە ماوەی نیشان ودەستگیرانیدا کە دایك و باوك بەمەیان زانی زۆر ئامۆژگاریان کردن بەلاّم هەر نەگۆڕان ، گوایە زوو هاوسەرگیری دەکەن و سەربەستن هەرچی بکەن هێلی سووریان بەزاند.

پاش سێ مانگ گیرو گرفت ڕووی تێیان کرد و لێك جودا بوونەوە کێشەو گرفت لە نێوان هەردوو بنەماڵە کەش دروست بوو،لە خزمایەتی بەرەو دوژمنایەتی لەسەر نارێکی رەفتاری ئەم دووانە.

هۆکارەکەی:ڕێدان بوو بە بووك وزاوا کەوا هەرچی هەبوو بیکەن و وەکو ژن و مێرد ڕەفتار بکەن ، ئەمەش بووە هۆکاری لەبەرچاوی کەوتنی یەکدی ڕەش بن وجودا بوونەوە بەیەکجاری پێش گواستنەوە خراپ مامەڵە کردن.

## کەسوکاری مێرد بەرانبەر ژنەکە

ژنێك زۆر مێردەکەی خۆی خۆش دەویست...هەروەها مێردەکەش ئەوی خۆش دەویست گیرو گرفتێکی ئەوتۆ لە نێوانیاندا نەبوو باس بکرێ.

بەلاّم گیرو گرفت لە خەسو و خەزورەوە بوو لەو کاتەی مێردی لە ماڵ نەدەبوو هەرچەندە ژنەکە زۆری قبوڵ دەکرد و پەردە پۆشی دەکرد تا مێردەکەی پێ ی نەزانێ، بەلاّم لە ناچاری تەقیەوە و مێردەکەی بەمەی زانی و توشی شۆك بوو لە ڕەفتاری باوکی و خۆشەویستی ژنەکەی سەری سوڕما سروشتی باوکەکە وابوو، بەهیچ ڕازی نەدەبوو هەردەم تووڕە دەبوو ئەگەر بووکەکە ڕەفتارێکی لە گەڵ مێردی خۆی بکردایە باوکەکە تووڕە دەبوو لالوت دەبوو لە کوڕەکەی خۆی.

## سەرقاڵی مێردبەبێ رازیبوونی ژن

ژنێــك دەگێرێتــەوە و دەڵێ:مێردەكــەم زۆرئاســایبوو...لەهەمان كاتــدازۆرم خــۆش دەویســت چـونكە گـەنجێكی دیندارووبەرەوشــت بووسوپاس بۆخودا...

بەلاَم هەر لەسەرەتاوە هەستم بەوەرسی وبەدبەختی خـۆم دەكـرد لە ماڵەكەمـدا پـاش لـەدایك بـوونی منـداڵی یەكـەم ، مێـردە كـە م دكتۆر بوو لە نـە خۆشـخانە یـەك و شـە وان لـە وێ دە مایـە وە، پــاش دەوامــیش دە چــووە كــاری بانگــە وازی ، دوای دە چــووە عیادەكەی خۆی زۆر جار لە درەنگانی شەو كە دە هاتە وە ،پشكنین یا خود حالەتێكی ناكاوی بۆدەهات دەبـوو بچـێ، ژیـانم بـەم جـۆرە بوو وام لێ هات هەر چاوەروانی بكـەم، سـەیری خـۆم وحـاڵم دەكـرد پەست دەبووم.لێرەدا پێویستە لەم جۆرانە هە لوێستـە بكـەین لـەو بەسەر هاتە پەند و ئامۆژگاری وەردەگرن.

## مێردێك حەز لە سەیران ناكات

ژنێك دەڵێ لە خێزانێكی مامناوەنیدا پەروەردە بووم، سێ برام هە بوو لەگەڵ دووخو شك ، دووەم منداڵ بووم لە ریز بەندییدا.
سەربەستی تەواوم هە بوولە دەرچوون وسەردان وسەیران وكاری هاوبە شی خێردا،شوم بە كورێكی دیندار كرد، پاش سێ ساڵ چاوەروانی منداڵێكم بوو، دوای دووگیان بوومەوە سوپاس بۆ خوا، بەلاَم مێردەكەم حەزی لە پیاسەو دەرچوون نەبوو ركی لە سەیران كردن بوو، حەزی لە خەوی چەندان سەعات ومانەوە لە ماڵ دەكردو مۆڵەتی زۆر پێ خۆش بوو،ئەمەش زۆر لای من ناخۆش بوو...
رۆژێك برادەرێك داوای گەشتێكی یەك رۆژی لێكرد رەتی كردەوە نەچوو بە هەنجەتی ئیشوكاری،هەرچەندە نەچووە ئیشەكەش، بە درێژایی رۆژەكە هەر نوست، هاورێكەم پەیوەندی پێ كردم ئەوەی پێ گوتم. زۆر خەفەتم خوارد دامە پرمەی گریان، گیروگرفت زۆر گەورە تر بوون لە نێوانمان دا چ بكەم؟ چۆن ئامۆژگاری بكەم؟
بێگومان ئامۆژگاری بۆ ئەم جۆرە پیاوە دەبێ هەركەسەو حەقی خۆی پێ بدرێ، هەروەها گەڕان وسەیرانیش لە كارە زەروورییەكانە بۆ بەردەوامی ژیان، جا ئەگەر كەسێك حەزی لێ نیە ئەوە بزانە

بەرانبەرەکەت وانیە ئەو حەز لەو جۆرە چالاکیانە دەکات هەمیشە لە کونجی ماڵ ژیان نابێ دەرچوون وپیاسەیەکیش هەربووە.

## هەڵەی پیرە مێردێك

ژنێکی (٣٥)ساڵی شوی کردووە، سەربووردەیەکی درێژی لە منداڵیەوە هەیە لەگەل ئەو مێردەی لەگەڵیدا منداڵەکانی بەخێوکردوە، دوو کوڕوکچێکیان هەیە وخاوەن هاوسەرن، کوڕی گەورەی پاش ململانێیەك ژنەکەی خۆی تەلاق دا، کابرا دووبارە ژنی هێناوە لێرەدا زۆر دڵرەق بوو لەگەڵ ژنەکەی،بەلام خەزورەکە هەردەم لەگەڵ بوکەکەی پەیوەندی باش بوو، بەڕادمیەك لە گەڵ بوکەکە لە زڕدایکەکەیان دەدا لە سەر بوکەکە.

ژنەکەی بەجێ هێشت لەگەڵ کوڕەکەی دووەمی دەژیا، پیرە مێرد شێت وهار بوو بەڕادمیەك کارومباو ئاوی لەسەر بڕین، دوای چەند مانگ دایکەکە گەڕاوە بۆ ئەوەی لەگەڵیدا بژی، بەلاْم باری ژیانی ئابووریان زۆر قورس بوو، ئەوەندە پارەی نەدەدایێ بەشی بکات سەرباری هەردووکیان جاری دووەم گیروگرفتەکان گەورەتر بوون لەپێشتر.

کار لە نێوان باوك وبوکەکە پەیوەندی بە خۆشەویستیەوە نەبوو،

بەلكو ئەم ژنە توانی باوكەكە هان بدات بۆ ئەوەی پەیوەندی لەگەڵ ژنەخەسوەكەی خراپ بێ، هەروەها لەگەڵ كوڕەكەی دیكەی و لەگەڵ دوو كچەكەش بەڕادەیەك چەندان جار لێی دەدان ولەماڵ دەری دەكردن....

هەموو هەوڵەكانی ئاشت كردنەوە سەرنە كەوتن لە لێژنەكانی ئاشت كردنەوە هەروەها (چەكە داراییەكان-ئەمانەت-دادوەری-دادگا)........:

ئەوجا چ بكەین لەگەڵ ئەو پیاوەدا؟

هەندێك لەم بارودۆخانە بەهۆی بارودۆخی ژیان وشێوازی پەروەردە ی نارێك ڕوودەدەن، وئەو خووە بەدرێژایی ژیانی لەگەڵیدا دەمێنێتەوە.

جار هەیە لێی دەبێتە نەخۆشی دەروونی وهاوسەنگی خۆی لە دەست دەدات، ناتوانی كارەكانی بەرێك وپێكی بكات، هەروەها تووشی هەڵەی زۆر دەبێ، پێویستی بە چارەسەری دەروونی و دكتۆری دەروونی هەیە ، بۆ گەڕانەوەی هاوسەنگی دەروونی ودەربازبوون لە كاریگەرییە نالەبارەكانی دەروونی.

# ململانێ لەسەر خۆشەویستی

پێکەوە لە ژیانێکی بەختەوەرو هێمن وئاسوودە دەژین، هەردووکیان زۆر یەکتریان خۆش دەوێ، دوومندالّی جوانیان هەیە، بەلاّم ژنەکە نهێنی خۆشەویستی خۆی بۆ مێردەکە ی گێڕایەوە کە پێش داخوازی زۆری خۆش دەویست وحەزی لێ دەکردو خۆزگەی بوو داخوازی بکات ، فلان وفلان زۆر کەس دە هاتنە داخوازی بەلاّم شوی نەدەکرد لەبەر خاتری ئەو مێردە، ئەوجا لە مێردەکەی پرسی: ئەرێ منت خۆش دەویست پێش داخوازی کردنم؟

پیاوەکە گوتی: تۆم وەك خوشکم خۆش دەویست تا کاتی هاوسەرگیری ئەوجا دوایی خۆشەویستی دەستی پێکردو گەشەی کرد بەرانبەرت !لێرەدا کێشە و گرفت دەستی پێکرد.

هە لوێستی شاعیرانە بە ڕەوپشێوی و تورەبوون گۆران...

مێردەکە وایدەزانی کەنابێ پێش مارەکردن خۆشی بوێ، بەلام ژنەکە سوربوو لەسەر ئەوەی کە وا پێش هاوسەرگیری مێردەکەی ئەوی خۆش ویستووە، بەلگەو نیشانەی ئەوە بوو بە سەردانی کردن وپەیوەندی بە براکەیەوە کردووە ،کە دەهاتە مالیان گوایە هۆکارەکەی نزیکبونەوەی هەموو لەبەر خاتری چاوڕەشی ئەو بووە لە پێش داخوازی، بەلاّم مێردەکەی دەیگوت شتی وا قەت نەبووە .

دەی باشە چیان پێ بڵێین؟

بۆ ئەم ژن ومێردە دەڵێم: بۆ ئەم جۆرە ململانێیە پێویستی بە گفتوگۆی هێمنانە هەیە، هەروەها هەردوولا با هەوڵ بدەن کە گوفتارێك بڵێن کە دڵی یەکدی ڕازی بکەن ورەنگە ئەویش ڕێپێدراو بێ لەم جۆرە بارودۆخەدا لەگەڵ ڕەچاوکردنی داوانە کردنی شتێك کە لە توانای بەرانبەری دا نەبێت وە زیادەڕۆیی نەکات کە نەتوانی بە دی بهێنێ هەروەها شتێك نەورژێنێ کە کە کێشە بنێتەوە .

## ژنێك تەماعی لەمێردەکەی زیاتربوو

هەموو ئامانجی کچەکە ئەوە بوو کە مێرد بە گەنجێکی دیندارو بە رەوشت بکات، بەلام لە شارۆچکەکەی بە نسیبی نەبوو،نیسیبی لە گوندان بوو،خۆشی شارستان بوو، رازی بوو بچێتە گوند لەگەڵ مێردەکەی دائەو کاتە سەرەتای دەستپێکردنی کاری خێرخوازی بوو لەو گوندەدا، بووە بەرپرس لە دامەزراوەیەکی خێرخوازی لەوێ مایەوە، مێردەکەش پاڵپشتی زۆر بوو بۆئەم کارە بەلام نەبەرپرس ونەپەیوەندی بەکارەکەوە بوو ، ژنەکە هۆشمەنترو

توانای زیاتر بوو، هەموو بەرپرسەکانی دەناسی و دەیزانی چۆن هەڵسوکەوت لەگەڵیاندا دەکات، هیچ رۆڵیکی شك نەدەبرد بۆ مێردەکەی.لەویٚ...هەندێك کاروبارهەبوو بە هۆی مێردەکەی دەیگەیشتیٚ وئەنجامی دەدا ئەمەش پشێویکی گەورە بوو وتەنگی پیٚ هەڵدەچنی، وای لیٚ هات چاوەڕی یٚ ژنە بەرپرسەکانی دەکرد لەهەندیٚ کاروباردا، جا ئەوکاتەی کە گۆڕانکاری لەکارەکان کرا لە بەرپرسێتی لادرا،واگومانی دەبردکە خەتای مێردەکەی بوو چونکە بەر پرس نەبوو...چی پیٚ بلێن؟

بەو ژنە دەڵێین کەخوا ی گەورە پلەوپایەی هەندێك کەسی بەسەر هەندێك کەسدا بەرز کردوەتەوە، هەر کەسەو شارەزای توانای خۆی هەیە بۆیە پێویستە سەیری لایەنە چاکەکانی هاوسەرەکەت بکەی،نەك لایەنە خراپەکانی ، غەمباریش نەبی لەسەر شتێك کەلە دەست چوو بیٚ،چونکە خواپاداشتی هەموو زیانێك دەدا تەوە ئەگەر سەبری لەسەر بگریٚ، جا با درکێکیش بیٚ کەبچێتە دەست ورزقیش بەدەست خوایەو کەس بەشی کەس ناخوات.

# بەهەڵە تێگەیشت

گەنجێك ئافرەتێكی كرێكاری خواست، هێشتا باوكی مابوو پاش مردنی باوكی دایكی كوڕەكە دوور ونزیك دەیبوغزاندن، واتە هەموو هەڵسوكەوتێكی ئەو دوو هاوسەرەی پێ ناخۆش بوو بە ئاشكرا داوای لە كوڕەكەی دەكرد لە ژنەكەی جودا بێتەوە، بەڕادەیەك ئیرەیی بە نوستنیشیانی دەبرد لە داخان خۆی نەخۆش دەكرد وبۆڵە بۆڵی دەكرد وكوڕەكەی بۆ ئیشی دوور دەنارد وسەرقاڵی دەكرد، ئەو بێوەژنە زمانی زۆر شڕ بووئەگەر لە بەر خاتری خواو دایكایەتی نەبا لەمێژ بوو كورەكە دەری دەكرد ،بەلام زۆر سەبری لەسەر گرت خوا سێ كوری دانێ،دایكەكەش هەر منەتی بەسەردا دەكردن و گوایە بۆەتە خەمكی خەمان وئەو خۆی منداڵەكان بۆیان بەخێو دەكات وبارگرانی هەربۆ ئەوە.

چارەسەر بۆ ئەم كێشە چی یە؟

بێگومان خودا نایەوێ كەس زەرەر لە خۆی بدات یان لە خەڵكی بدا، هەروەها چاكەو ڕێز لەگەڵ دایك وباوكان دا واجبە، هەروەها بەڕێوە بردنی ماڵ ومنداڵیش ئەركێكە لەسەر هەمووان، واتە ئەركێك نابێ قەدەغە بكات لە بەرانبەر ئەركێكی دیكە، لەبەر ئەوە لەسەر ئەو كوڕەیە بە دوای كەسێك بگەرێ كە ئامۆژگاری ئەم

جۆره دایکه بکات وله هەڵه دووری بخاتەوه، ئەگەر پێویستی به چارەسەریش هەبوو ئەوه دەبێ بۆی دابین بکات، وێرای ڕەچاوکردنی حاڵەتی تەنهای دایکەکە ژیانیان پێکەوه وپشت تێنەکردنی، بەڵام ئەگەر دایکەکه بەم جۆره ڕێنماییانەرازی نەبێ و چارەسەری نەوێ، ئەوه بزانه کەوا نەخۆشە، چاوت له خێزانەکەت بێ وپێش کار له کار بترازێ دەربازییان بکه لەم مەینەتیەدا.

## هاوسەرگیریەکی ناهاوشان

کچێکی زانکۆ شووی به کوڕێکی سەرووی خۆی کرد لەڕووی ئابووری، کچەکەهەمیشه له بەرانبەری هەستی به کەمی ولاوازی خۆی دەکرد، کابرا زۆر به بڕوانامەکەی خۆی دەنازی که له دیواری هەڵواسی بوو، هێشتا پێی دانەمەزرا بوو، زۆر گوێ ی دەدا دایکی وبەسەر ژنەکەی دا دەینازی وقسەی دایکەکەشی به بێ لێکۆڵینەوه وەری دەگرت زۆر جار لەسەر دایکی له ژنەکەی دەداو وای دەزانی که قسەی دایکی قورئانه وڕاسته بەبێ هیچ لێپێچانەوه، ژنەکەش زۆرلێ ی پڕببوو، ڕۆژێك دەستی کردبەجوێن دانی مێردەکەی

بۆئەوەی لەسنووری خۆی رایبگریٚ،ناچاردەستی بەگریان کرد لەدەرەوەی ماڵەکە بۆئەوەی کارێك بکات و لەودۆزەخە خۆی رزگاربکات.

چارەسەربۆئەم جۆرە کێشانە:-

پێشەکی بۆخۆپاراستن پێویستە دوورکەوینەوەلەهاوسەرگیری ناهاوکوف بەتایبەتی ئەگەردینداری و رەوشتی تیادابەرجەستە نەبوو،بەڵام ئەگەر دوو مەرجی دینداری ولەخواترسانی تێدا هەبوو ،ئەوەژن ومێرد کە زۆرگیروگرفت کە چاوەڕیان دەکات بە پەیامەکەیەیان بەرپەچی دەدەنەوە،وێڕای دوورکەوتنەوەی هەندێك لەو دایکانە لەو بیرکردنەوانەی کە گوایە کوڕەکەیەیان موڵکی ئەوانە....وگوایە بووکەکە هاتییە لێیان داگیر بکات ولێیان ببات وئەم جۆرە دایکەش بەهەموو شێوەیەك هەوڵ دەدات لێکیان بکات وجودایان بکاتەوە،لەکاتێکدا ئەم جۆرە کارەساتە ستەمە چونکە هەموو گەنجێك پێویستی بە هاوسەر هەیە وخوداش وای داناوە،هەروەکو هەموو ژن ومێردێك مافی سەربەستی خۆیان هەیە......کەکاری پەیوەندی وئەرکی هاوسەری خۆیان ئەنجام بدەن.

## مانای هاوسەریەتی نازانێ

کورێکی کۆك وجوان ورێك وپێك،کچێکی دەوڵەمەندی بەنازی خواست،خوا کردی سامانی باوکی کچەکەی کەوتە دەستی، کچەکەش هەرچی بیویستبایە دەیکرد، فەرمانی لەسەر سەران بوو،کاتێك مێردەکەی سەفەری هەندەرانی کرد،ژنەکە خودا دوومندالی پێ بەخشی بوو ،شوقەکەی بەجێی هێشت وچووە مالی باوکی،لەسامانی مالی باوکی دەیخواردو خەرجی دەکرد بۆخۆی ومندالەکانی، پارەی مێردەکەشی پاشەکەوت دەکرد،بەناوی خۆی لەدەفتەرێك دەینوسی ،مندالەکانی نارده قوتابخانەیەکیی تایبەتی بنەڕەتی ،کەمێردەکەی گەڕاوەو داوای پارەکەی کردەوە ئەو ژنە نکۆلی (حاشای)لێکردو چونکە لەبەر پارەی باوکی منەتی بەسەریدا دەکرد ، گوایە مندالەکانی بردۆتە باشترین قوتابخانەی تایبەتی، کاتێ مێردەکەی لەهەندەران بوو پەیوەندی پێیەوە کردووە و پەرۆشی بووە،مێردەکە بەدلپیسی ژنەکەی تاوەنبار کرد،ئەمەش لە شارەکە دەنگی دایەوە،خەلکی کەوتنە ناوبژیوانیان وپێکهێنانەوەیان، پیاوەکە بە هیچ شتێك ڕازی نەبوو تەنها مەگەر پارەکەشی بداتەوە پاش تێگەیشتنی خەلکی ولە ترسی حەیاچوون، هەموو پارەکانی وەرگرتەوە کە لە دەفتەرێك دا تۆمار کرابوون،

بەلام ژنەکە هێشتا دانی پێدا نەنا وە پێی لێنەدەنا، ئێستاش هەر وا پێکەوە دەژین وکەوتۆتە ژێر شەرمەزاری مێردەکەی، وەکو دەڵێن هێشتا فەرمانی پێ ناکرێ بەرفەرمان ئامادەیە بۆ جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی مێردەکەی.
ئەوجا بەڕاستی لەم جۆرە کێشانە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کەوا کەسێك ئەگەر لەسەر بناغەی ساماندارى ژنی داخوازی کردوو دینداری لە بیرچوو ئەوا سەرکەوتوو نابێ لە هاوسەرگیریەکەی دا (هەندێ جار)، و پێی دەڵێن: تۆ ناتوانی سامان وجوانی دنیا دەست بخەی بەلکو گونجانی هاوسەرەکەت باشترە وسەرشۆڕکردنی ژنەکەت پاش ئەوەی تاوانبارت کرد زۆر لە خۆی وسامانەکەی خراپترە .....ئەم جۆرە کارەش کارێکی باش نی یە،چونکە بە هیچ جۆرێك لەم جۆرە مالأنە بەختەوەری وناسودەی ناشەکێتەوە ونایەتەدی وکەسیش تێیدا بەختەوەر نابێ، دوای ئەو هەموو تاوانبارکردنەی یەکتری.

## بە هەڵە هەڵبژاردنی هاوسەر

گەنجێك لە خێزانێکی دیندار هەر لە منداڵیەوە لەسەر دینداری ورەوشت پەروەردە کراوە، قورئانی لەبەرە لە کاروباری خێرخوازی وبانگەوازیدا لێهاتوو زیرەکە، کاتی ژن هێنانی هات لەچەند دەرگایەکی دا بۆ داخوازی ، هەر جارەی بەهەنجەتێ نەدەبووە قسمەت ، یان لەسەر جوانی یاخود لەسەر گرانی ماڵ دانان ونەخت یانیش لەبەر پیشەی ژنەکە،هەتا حاڵ گەیشتە کچێکی سفورو ناپابەند بە دینداری، خەڵکی زۆر ئاگاداریان کردەوە لەم جۆرە خێزانە، بەلأم کورەکە گوێی نەداییو خواستی، ئێستا لە کاری بانگخوازی دوور کەوتۆتەوە، ناتوانێ هیچ شتێك لە رەوشتی ژنەکەی بگۆڕێ، بەڵکو ئەو ژنە توانی مێردەکەی بگۆڕێ، جاریش هەیە خراپە و گوناه دەکات لەبەر خاتری ڕازی کردنی دڵی ژنەکەی.

جا لەم جۆرە حاڵەتە زۆرێك لەوانەی کە چوونە ناو ئەو جۆرە قەفەسەو هاوسەرگیریان لەم جۆرە کردووە، بە هەنجەتی ئەوەی گوایە چاکی دەکات ودەیگۆڕێ ئەنجامەکەی پێچەوانە دەرچووە ، لە هەمان کاتدا کە کچێك ناخوازێ کە دیندارو ڕەوشت بەرزە ئەو بابزانێ بۆکەسێکی بەجێ دێڵی کەنازانێ ڕێگای خووڕەوشتیش لە

گێنــدەرە ادەبێتــە هەیتــە لەســەری بــەناوی ئــازادی مــاف ژنــان و سەرپەرشـتی ومێـردا یـەتی سـتەمە وبـەو جـۆرە کـارەش کۆمـەڵگا بەدوو سەرە زەرەر دەکات.کەواتە بۆ بڕیـاری هاوسـەرگیری زۆر ورد بـــەوە، بـــا بڕیاردانەکـــەت دوای وئـــارامی وبیرکردنەوەیـــەکی وردو دروست بـێ و پەلەمەکە نـەکو تێدەکەوی. وەکو ئـەوەی بـۆ ڕیـش چوو سمێڵیشی لە سەر دانا .

## بێ وەفایی و وستەم

گەنجێکی ئەندازیار کچێکی نۆشداری دەرمانسازی خواست وهێشتا لەسەرەتای دامەزراندنی بوو کەم دەرامەت بوو،کچەکەش ڕازی بوو کەلەگەڵ خەسوو خەزووری ومێردەکەی پێکەوە لەماڵێکدا بژین لەیەك شووقەو تەنها یەك گەرماویان هەبوو،ژنەکە هیچ سەر بەخۆیەکی نەبوو لەومالەدا تەنها لە ناو ژوورەکەیدا نەبێ، بەلاّم پێی ڕازی بوو،بەتێپەڕ بوونی ڕۆژگار ژیانی ئابووریان باشتربوو، دەرمانخانەیەکی کردەوە، پیاوەکە هەستا شوقەیەکی سەربەخۆی گرت ، خوا پێنـج منداڵی دانێ یەکێیان بەمنداڵی خودا بردیەوە، پیاوەکە بەرەبەرە دەوڵەمەند بوو ،پیاوەکەلە کۆمپانییایەك ئیشی

دەكرد وموچەی زۆرباش  بوو، وای لێهات مێردەکە کەوتە هەنجەت
لە ژنەکەی وسوکایەتی پێ دەکردو قسەی ناشرینی پێ دەگوت،
بەڵکو لێ ی دەدات وقەدەغەی هاتوچۆی کەسوکاری لێی دەکرد،
هەمیشە عەیبی لێ دەگرت، تاکو وای لێهات باسی ووشەی تەڵاقی
دەکرد وجار دوای جاریش خراپتر دەبوو،دەری دەکرد ودەی هێناوە،
پاشان خانوویەکی چەند نهۆمی جوانی بە کۆمەکی ژنەکە دروست
کرد، ئەوجا دیسان دەری کردەوە، پێی گوت: چیدی نایەوە
تەلاقیشت نادەم هەتا خۆم ئەمەوێ وملکەچ ئەکەی بۆ هەموو
داخوازییەکانم، پاش پاڵە پەستۆیەکی زۆر پاش حەڤدە ساڵ
وزەحمەتی ڕازی بوو تەلاقی بدات بەرانبەر تەنها کەرستەی ناو
مەتبەخ کە حەڤدە ساڵی بەسەردا تێپەڕی بوو کەچە ببون کە
بیداتەوە ژنەکە ولەگەڵ کچێکی بداتێ  کە هەشت ساڵان بوو
هەروەها لە دیتنی منداڵەکانی دیکەی قەدەغە کرد، و منداڵە
گەورەکەشیان لە یەکەمی ناوەندی بوو، وپێی گوت: دوو هەفتە
جارێك بۆت هەیە تەنها چارەگێك بیانبینی، هەروەها قەدەغەی
کرد منداڵەکان پەیوەندی بە دایکیانەوە بکەن، پاشان ژنێکی
دیکەی هێنا، ژنی یەکەمیش لەناو داخ وکەسەرو گریان مایەوە
هەتا ئێستاش هەروا هیچی پێ ناکرێ لەبەربێ وەفایی و  کەڵلە

ڕەقی پیاوەکەو بەس، خوا دەرگای خێر لەم ژنە داماوە ستەم لێکراوە بکاتەوە ورزگاری بکات،لەم جۆرە کارەساتانەدا دەڵێین:- پێشەکی هەموو بزانین کەستەم تاریکیە لە ڕۆژی قیامەتدا، سەبریش کلیلی رزگاری و بەهەشتە، کەواتە با ئەو خوشکە بزانێ کەوا خوای گەورە تۆڵەی دەکاتەوە وحەقی نافەوتێنێ مادەم ئەو ژنە بەرێزە هەموو ئەرکێکی سەرشانی خۆی بە دیهێناوە بەرانبەر مێردەکەی،خوای گەورەش پشت وپەنای ئارامگرانە وزوو یان درەنگ خوا حەقی دەکاتەوەودەبینین کێ سەردەکەوێ وکێ بەرەو دۆزەغ دەبرێ.

(ئەگەر تۆبە نەکات)، هەروەها بۆ ئەم جۆرە پیاوەش دەڵێین: ئەگەر ئەو هەموو ستەمەت بە تەواوی و ویستی خۆت ئەنجامت داوە ئەوا بزانە کەوا خوا تۆڵەت هەر لێ دەکاتەوە چ زوو چ درەنگ، خودا مۆڵەت دەدات بەڵام لەبیرناکرێ، دەی کەوایە هەتا زووترە تۆبە بکە پەشیمان ببەوە پێش ئەوەی خودا تۆڵەت لێ بکاتەوە، چونکە خودا حەقی بزنی بێ شاخیش لە بزنی شاخدار دەکاتەوە لێپێچینەوە لەسەر تۆزقاڵێکیش دەکات ودەسەنێ وحەقی کەس لەسەر کەس نایەڵێ ولوتی ستەمکاران دەشکێنێ وزیاتریش.

بەڵام ئەگەر ئەم تاوانەت کردووە ئاگات لە خۆت نەبووە، ئەوا

بزانه زۆر له مرۆڤایەتی دووری وبزانه کەوا ئەم جۆره تاوانه قێزەونانه نیشانەی نەخۆشی دەروونیەو هەتا زووه برۆ چارەسەری خۆت بکە، هەتا بگەرێیەوە سەر خۆت وتێبفکری وتاریکی بەرچاوت رۆشن ببێتەوە.

هەروەها ئەم فەرمووده‌ی نازدارمان (ﷺ) له بیر مەکه که فەرموویەتی: ( خَيْرُكُمْ خَيْرُكُمْ لِاَهْلِهِ وَاَنا خَيْرُكُمْ لِاَهْلي)

واته: باشترین کەستان ئەوەیە کەوا بۆ کەسوکاری باش بێ ومنیش له هەمووتان باشترم بۆ کەسوکارەکەم وخێزانەکەم

## نەزانی وپەلە کردن

ئـەم کچـە هێشـتا لـە سـەرەتای بـەهاری تەمـەنی دایـە وخـاوەن بڕوانناـمـەی دبلۆمـە، بـەڵێ بڕوانناـمـەی دبلـۆمی تـەکنیکی هـەبوو تەمەنی(١٨) ساڵان بوو شـووی بـە گـەنجێك کـرد پـاش پـازده مـانگ کێشەو گرفتیان دەستی پێکرد گەنجەکە دەیگوت ئەو ژنه بایەخ بـە پەیوەنـدی تایبـەتی نێوانمـان نـادات، خـۆی بـە ماڵـەوه خـەریك دەکـات، هـەروەها لـەکاتی چـوونه مـاڵی دایکـی بایـەخی پـێ نادات(وایەو وایه....) کچەکەش نکوڵی لێ دەکردلەسەر ئەم قسانه ،

دوای پێنج مانگ لە هاوسەرگیری ژنەکەی دەر کردوو دوای ناچار بەم وبەو داوای هێنانەوەی دەکرد ولەو کاتە دووگیان بوو، بەلاّم سەری نەدەگرت بێتەوە ، پێش دوو مانگ زگەکەی دانا، بەبێ مێردەکە زەحمەتی ببینێ، ئێستاش نەدەیهێنێتەوە ونەدەستی لێ دەشوات، دەشڵێ ئەمن ڕازیم تەلاّقی بدەم وحەز دەکەم، بەلاّم بەمەرج هیچ لەگەڵ خۆی نەبات واتە تەنها کەرستەی مەتبەخ ، بەڵێ زێڕەکانیشی کە لێی فرۆشتووە بەبێ ئەو پێی بزانێ کە لەو بارەوە پرسیار لە پیاوەکە کرا گوتی: ئەوە تایبەت نیە بە تۆ من خۆم بۆم کڕیە، ئێستاش حاڵیان هەروەها بەردەوامە بە بێ هێنانەوە یان تەلاّقدانی، شایانی باسە ژنەکە لە خێزانێکی هەژاری سادەیە.

لەم جۆرە گیرەگرفتانە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە نەفامی لە هەڵسوکەوتی هاوسەران ونەزانی لە هەڵسوکەوتی سەرجێ ی وئارامنەگرتن لەسەریەکدی وپەیڕەو نەکردنی دینداری لە مافەکاندا دەبنە کێشەو گرفتی لەم جۆرە ، هەروەها ئەو کۆت وبەندەی کە کابرا لەسەر ژنەکەی سەپاندووە لە کێشەی مارەیی، هەر هەموو ئەمانە ئاماژەن بۆ وەلاّمدانەوەی ئەوە کەبۆچی لەم سەردەمەماندا ئەم هەموو گیروگرفتە زۆر ڕوودەدات لە ناو خێزان

وژن ومێردەکاندا وتەلآقدان زۆر بووە؟

ئامارەکان دەڵێن تەنها لە (٦) مانگی یەکەمی ئەم ساڵ (٢٠١٢) تەنها لە سلێمانی (٩٣٠) حاڵەتی تەلآقدان لە سلێمانی ڕوویان داوە کە ئەمەش یەکجار زۆرە (سەرچاوە/ تەلەفزیۆنی سپێدە).

## ستەم ولاوان وتاوان

گیروگرفتی کچێك کە شووی بە گەنجێك کردووە، ئەو ژنە کە پاش ماوەیەك دیتی کوڕەکە زۆر بە دایکیەوە پەیوەستە، هەروەها باسی نهێنی نێوانی خۆی وژنەکەی بۆ دایکی دەگێڕێتەوە، کچەکەش بەوە ئازار دەخوات، ئەو کوڕەش زۆربەی شەوانی لەسەر پێخەفی دایکی بەڕێ دەکات، بە بێ چوونە سەر جێ ی خۆی وزۆر هۆگری دایکی خۆی بووە ژنەکەی فەرامۆش کردووە!

ئێمەش دەڵێین ! بەڕاستی ئەم خۆشەویستیەی کوڕەکە بۆدایکی لە ڕادە بەدەرە ، لە دوا یشدا دەرکەوت کە کوڕەکە سەر جێی دایکی خۆی دەکات (پەنا بە خوا) ، ئە ویش لەسەر داوای دایکی سێکس لە گەڵێدا دەکات، هەڵبەتە سروشتیە ئەو هاوسەرگیریە کەوا کۆتاییەکەی بە تەلآق کۆتای بێ هەرچەندە منداڵێکی لێی هەیە،

بەلاَم منداڵەكەش لە  ژنەكەی دەسێنێتەوە ودەلێ یان بە خۆڕایی بەخێوی دەكەی یانیش بۆمنی بەجێ بهێڵە، ئەم ساوایەش تەمەنی لە مانگێكدا ڕەت نابێ وساوایەكی شیرە خۆرەیە ودایكەی تەلاَقدراوە..... توشی ئەم بەزمەی داپیرە ی بووە.

دایك وكوڕێك پێك فێربن!اتوخوا چیدی لەوە تاوانترهەیە؟!ئەوجا بەڕاستی سەختە باسكردنی ئەم جۆرە حاڵەتانە كە توشی لادانی ڕەوشتی بوونە وسەرباری نەفامی لە بەرانبەر ئەرك ومافەكان بەرانبەر ژنەكە كە هەردووكیان دایك وكوڕەكە پێویستیان بە چارەسەر هەیە، بەلاَم ژنەكە هەر سوپاسگوزاری خوا دەكات كە لەو جۆرە مێردە دەربازی ،بووخوا ڕەحمی پێكردیە هەرچەندە خەم وخەفەتی هەبێ وكۆس كەوتە بێ ،بەلاَم ئەم مێردە شایەنی ئەم ژن و ژیانە نیە، چونكە ئەم جۆرە خێزانە تائەو پەڕی بێ سەرو بەری وتاوانبارن هەر تەنها چارەسەریان لای دەرمانخانەی ئیسلامە

## بۆ خۆشەویستی مێردەکەی دەچێتە لای شێر

زۆر ئافرەت هەیە دەیەوێ دڵی مێردەکەی بۆ خۆی ڕابکێشێ بەڵام بەڕێگای ناشەرعی یان شێوازی بێ سوودوچارەسەری هەڵە وەردەگرێ ڕەنگە بە مەبەستێکی پاکیش بێ ،بەڵام ڕێگاکەی هەڵەیە ئەم ڕووداوانەش زۆر جار دووبارە دەبنەوەو کە بەسەرهاتی ڕاستەقینەن ، بەتایبەتی لەناوچە میللیەکان و گوندنشینەکان، هەروەکو ئەو ڕووداوە:- جارێك ژنێك لە گوندێك دەچێتە لای زانایەك وا دەزانێ فاڵچیە وداوای لێدەکا کەنوشتەیەکی بۆبکات هیچ ژنێك ئەوەندە خۆشەویستیەیی لەمێردەکەی نەدیدبێت:

زاناکەش کە پسپۆڕ و شارەزا بوو لەم بوارەدا گوتی ئەوەی تۆ داوای دەکەی ئەوندە ئاسان نییە و زۆر گەورەیە، گوتی:دەتوانی باجی ئەو هەموو ماندووبونە هەڵگری؟

ژنەکە گوتی: ئا بەڵێ......

زاناکە گوتی: ئەو کارە ناکرێ هەتا داوە موێك لەملی شێرێك نەهێنی....! گوتی:شێر؟ گوتی:بەڵێ شێر! ژنەکە گوتی:چۆن دەتوانم شێر دڕندە یە ڕەنگە بمخوات!ئایا ڕێگایی ئاسانتر نیە؟

شێخەکە گوتی:نەخێر ناتوانم ئەوینی مێردەکەت ڕابکیشم بێجگە لەم ڕێگایە و ئەگەر دەتەوێ سەرکەوتوو بی دەتوانی بیری لێ بکەیتەوە و ڕێگا چارەیەکی گونجاوبۆ خۆت بدۆزیتەوە.......

ژنەکە ڕۆیشت هەر بیری لێ دەکردەوە و سەرسام ببوو کە چۆن بتوانێ تاڵە موێك لە ملی شێرێك بکاتەوە!!

دەستی کرد بە پرسیار کردن و پێشنیار وەرگرتن: گوتیان شێری دڕندەیە نابێ برسی بێ و پێویستە تێری بکەی تا لێ دڵنیابی و نزیکی بکەویتەوە...

ئامۆژگاریەکەی وەرگرت و بەرەو باخچەیەکی نزیکی ئاژەڵان ڕۆیشتودەستی کردبە فڕێ دانی پارچەگۆشت بۆشێرێك هەرلێی نزیك و دووردەکەوتەوە و بەردەوام بوو هەرگۆشتی بۆی فڕێدەدا تا شێرەکە بۆی دەستەمۆ بوو کەوی کرد.

جارێکیان لێی نزیك بۆوە هەتا وای لێ هات شێرەکە دلنیا بوو ئەو ژنە خۆشی دەوێ ژنەکەش دەستی بەسەردا هێنا و دەستی لە ملی کرد بەنەرم و نیانی شێرەکەش لەو پەری خۆشی و خاوبونەوەیدا بەزەحمەت نەبوو، ژنەکەش داوە موێکی لەشێرەکە دەرکێشا، ئەوجا موەکەی برد و بەپەلە و دڵخۆشی بەرەو زاناکە

ڕۆیشت گوایە فاڵچیە ئەو دەتوانێ ئەوینی مێردەکەی مسۆگەر بکات هەتا هەتایە،زانا کە مووەکەی دیت وبەژنەکەی گوت:
چۆن توانیت ئەم مووە وەرگریت؟!ژنەکەش دەستی کرد بەگێڕانەوەی بەسەرهاتەکەو کە چۆن توانی دڵی شێرەکە ڕازی بکات و لێی نزیك ببێتەوە و ئارام بگرێ و هەتا توانی ئەم مووە بەدەستی خۆی لەشێرەکە دەر بهێنی.
ئەوجا زاناکە گوتی:خوشکێ خۆ مێردەکەت لەو شێرە دڕندە تر نییە،وەکو ئەوەی لەگەڵ شێرەکەت کرد ئەوهاش دەتوانی دڵی مێردەکەت بۆ خۆت ڕابکێشی و تێری بکەوبیکە بەدیلی خۆت وبۆخۆتی مسۆگەر بکە.
جا ئەم بەسەرهاتە هەر بۆ ژن نییە و بەس بەڵکو بۆ مێردە کانیشە کە بتوانێ دڵی ژنەکەی خۆی بۆ خۆی ڕابکێشێ و خۆشی بوێ و ئەو شێوازانە هەڵبژێری کە ژنەکە پێی خۆشە و هەست و نەستی دەبزوێنی و وایی لێ دەکات کە هەمیشە دڵی لای مێردەکەی بێی بە بەردەوام ، بەوەش بەختەوەری ژیانی هاوسەری دێتە دی،چونکە بنیاتی خێزان پێویستی بە هاوکاری و هۆگری و تەباییە تاکو بتوانن بەرگەی ڕەشەبا و نەهامەتیەکانی ژیانی ناسۆری پێ بکەن.

## له نهێنیەکانی بەختەوەری

بەختەوەری لە خێزانێك نامێنێ کاتێك تێك نەگەن ،ماڵەکە پڕ کێشەدە بێ و بە تایبەتی لە ژیانی سەرجێی نێوان ژن و مێر ،بە تایبەتی تریش لەو کاتەی کەوا ژن نەزانێ بەختەوەری چۆن دروست دەبێت؟ ئایا بەختەوەری لە شارەزایی کابانییە یان لە خواردن دروست کردندا؟یان ئایا لە جوانیدایە؟یان لە زۆر منداڵ بووندایە؟ یان شتی دیکە؟

ئەمە نمونەی ژنێکە کە تەمەنێکی درێژ لە ژیانێکی بەختەوەر ژیاوە لە ماڵێك کەوا پڕی بووە لە بەختەوەریوئاسودەیی هەر چەندە ڕەشەبا و بومەلەرزە ڕووی تێ کردوون،بەلأم ئەم ژنە توانیویە بەسەر کۆسپەکاندا زاڵ بێت، خێزانەکەی لە بێدادی بپارێزی و لێ ی دەرباز بێت ،جاکاتێك لە و ژنەمان پرسی گوتی:بەختەوەری ماڵ بەدەست ژنەکەیە دەتوانێ ماڵەکەی بکاتە بەهەشت ،دەشتوانێ بیکاتە دۆزەخ؟

گوتی خوشکێ قەت مەڵێ پارە:زۆر ژن هەبووە دەوڵەمەند بووە بەلأم لە بەدبەختیدا بوون مێردەکانیان لە دەستیان هەلأتون، قەت مەڵێ منداڵ بەڵکو زۆر ژن هەبووە زۆر منداڵی کوڕو کچی هەبووە

بەلاّم مێردەکەی لێ ی بێزار بووە خۆشی نەویستوە سوکایەتی پێ کردووە وبەرێی کردووە.

زۆر ژنی کابانیش هەبووە بە درێژایی ڕۆژ هەر خەریکیناندین و خۆراکی خۆشبووە بەلاّم مێردەکەی ڕێزی لێ نەگرتوە هەمیشە گلەی لە مێردەکەی بووە ئەی کەوایە نهێنیەکە چیە؟

ژنە بەختەوەرەکە گوتی:مێردەکەم هەرچەندە زۆر تورە و توووند بووبەلام ئەگەر تورە بوایە من بێ دەنگ دەبووم و ڕێزم دەگرت، نەکەی لەگەڵ بێ دەنگی بە گاڵتە سەیری بکەی،با بە چاویش بێ تێ دەگات و ڕەنگە ئەنجامی بە مجۆرە خراپتر بێ.

بۆچی لە ژوور دەرنەدەچوی؟

گوتی: چونکە وا دەزانی لێی هەڵدێم و گوێی لێ ناگرم، بۆیە پێویست بوو من بێدەنگ بم و گوێ ی بۆ بگرم هەتا پیاوەکە هێمن دەبێتەوە،پاشان پێی دەڵێم:تەواو بووی؟ئەوجا دەردەچم چونکە ئەو پێویستی بەحەسانەوە یە، پاش هەراو گۆتە گۆتەکەی جا بە جێی دێلم دەچمە سەر کارەکەم و لای منداڵەکانم بەتەنیا بەجێ ی دێلم پاش شەڕێك کە بەتەنیا لەگەلیدا بەرپا کردم و منیش هیچ خۆم تێك نەدا ، پاشان چی دەکەی بەڕۆژوو بە هەفتە قسەی لە گەڵدا ناکەی؟

نەخێرئەگەر ئەو کارە خراپەی لەگەڵدا بکەم ' دوو سەری هەیە،کاتێك هەفتەیەك خۆی لێ دەگری ئەو دوو هەفتە وا دەکات کەوارابێت و پێویستە وانەکەم زوو بچمەوەلای ،چونکە ژن بۆئەو وەکو هەناسە و خواردن و خواردنەوەیە ،بۆیە بۆی دەبمە شنە باو بۆنی خۆش وگولاو... پاشان چیدی دەکەی؟

پاش دوو سەعات یان زیاتر پەرداخێك شەربەت یان چایەکی بۆ دەبەم دەڵێم فەرموو چونکە بەڕاستی پێویستی پێیە و بەئاسایی خۆی تێ دەگەینم.

جا پەشیمان دەبێتەوە و بە پەشیمانی دەپرسی تۆ تورە بووی؟

ئەوجا دەڵێم نەخێر ئەویش دەست دەکات بە پاساو هێنانەوە بۆ قسە ڕەقەکانی و داوای لێ بوردن لە من دەکات وە منیش بەقسەی خۆش دەیدوێنم و چاو پۆشی لێدەکەم.

ئایا باوەڕ بە لێ بوردن و قسە ڕەقەکانی دەکەی؟ هەڵبەتە چونکە من باوەڕم بە خۆم هەیە چونکە کەم و کورتیم نیە...

ئایا دەتەوێ باوەڕ بەقسەکەی بکەی کاتێك تورەیە و بەدرۆی بخەی کە ئاساییە؟ گوتی ڕۆژیکیان کابرا گوتی،سوێند دەخۆم بە ناموسی تۆ.

ژنەکە گوتی:کام ناموس؟

بەناموسی تۆ کە باوەڕ بە هیچ قسەیەك نەکەی کە بریندارت بکات لە کاتی کەسێکی توورە بوو تەنها لەو کاتە باوەڕی پیَ بکە کە هێمن و ئاساییە،وە قسە کانیشی لەوکاتە تەواوە.
یەکسەر لیَ ی دەبورم و هەموو جوێنەکان لەبیری خۆم دەبەمەوە و تەنها قسە چاکەکانی وەردەگرم، بەکورتی دەمەویَ بڵێم نهێنی بەختەوەری هاوسەری بە ژیری وزمانی ژنەکەوە پەیوستە،بەلاَم بەدبەختی هەمووی ڕەنگە لە گەورەکردنی شتە بچوکەکان بێت بەهەڵە و یاخود تورەبوون هەروەها تیختیخەی شەیتان دەبێتە هۆی گەورە کردنی کێشە کچکەکان لە خێزاندا ئەو جا ئەو ماڵە لە بازنەی ناکۆکی دا دەسورێتەوە بەبراوە و دۆراو و ماڵکاوڵی دەبیَ و کۆتایەکەی بەتەلاَق کۆتایی دێت.

# فاڵچی

فائیزه كه ئافرەتێك بوو له مێردەكەی توشی تەڵاق دان بوو،بۆیه وای دەزانی كه بەحەسودی چووه و چاوه زار وای لێ كردوه بۆیه كەوته دوایی چارەسەری،وەكو هەر ژنێكی نەزان چووه لای فاڵچیەك گوایه چارەسەری بۆ دەكات ، كه چووه لای فاڵچیەكه ناو لەپی دەستی خوێندەوه و پێ ی گوت من دەتوانم بەختی بەستراوت بكەمەوە!بەڵام چۆن بیگاتێ گوتی پێویستت بەهەندێك گوژمەی پاره وپولی زۆر هەیه بۆ ئەوەی فاڵچیەكه بگاته نوشتەی بەخته بەستراوەكه كه له ژێر زەویه و فائیزەش بەختی بكرێتەوەو سەركەوتو بێ و به ژیانێكی سەركەوتو بەختەوەر شوو بكاتەوه ،فایزه وای لێ هات پاره له دوای پارەی دەدایه فاڵچیەكه بۆ گەیشتنی به گەنجینەی بەختەوەری ، هەر ناوه ناوه داوایی شتی تازەی وەكو كەلەشێری رەش و شتی دیكەی لێ دەكرد هەر وەها جارێكی دی داوای كاوڕی دوو ساڵی دەكرد.

بەڵام ئەم ماوەیه زۆری كێشا ، فایزه پرسی نوشتەكه له كوێیه؟!

فاڵچیەكه گوتی:(لەمەچێتر)وجنۆكه لێناگەرێن بگەینه نوشتیەكه وبەتاڵی بكەین!

فائزه گوتی:چارەسەر چییه !! ...چۆن بیگەینێ؟

فاڵچیەکەگوتی:پێویستە شوو بکەی ئەو کاتە گەنجینەی بەختەوەر یەکە دەکەوێتە بەر دەستت.

فائزە گوتی: شوو بەکێ بکەم؟ گوتی: نازانم بەلاّم پێویستە و هەر دەبێ شوو بکەی.

فائزە لەگەڵ خێزانەکەی کەوتە خۆ هەتا کابرایەکی لاق بڕاوی نابینایی دۆزیەوەو شوی پێ کرد کە لای گرنگ نەبوو شێوەی کابرا و حال وبارو دۆخی! گرنگ بەختەکەی بکرێتەوە ...........

فائزە بەپەلە گەڕایەوە لای فاڵچیەکە و هەواڵی مارە کردنەکەی دایە،بەلاّم فاڵچیەکە زانیبووی کە زاوا پەکەوتە و کوێرە بۆیە بە فێڵ بە فائزەی گوت: پێویستە برادەرە جنۆکە کانم لە ژێر زەمین ببینم بۆ ئەوەی ڕای ئەوانیش وەرگرم سبەی وەرەوە ، بەیانی زوو فائزە بەپەلە گەڕایەوە لای و فاڵچیەکە گوتی: برادەرە جنۆکەکان بەم هاوسەرگیریە ڕازیی نەبوون.

فا یزە گوتی : لەبەرچی ڕازی نەبوون؟! گوتی:لەبەر ئەوەی کابرا کوێر و پەککەوتەیە چونکە پێویستە کابرا ساغ و بێ کەم و کوڕی بێت وەکو من !!!! ئەگەرنا کارەکە ئەنجام نادرێ وسەر ناگرێ.

فایزە بەو هەواڵە زۆر نیگەران بوو ، کاتێك کە فاڵچیەکە هەستی بە نیگەرانی و بێ ئومێدی لە ڕوخساری فائیزە کرد زانی کە هەر

سوره بۆ ئەوەی بگاتە بەختەوەریەکە پێی گوت:ئەگەر دەتەوێ دەتوانی بەمنیش کارەکە جێ بە جێ بکەی ، ئەگەر یەکجاریش بێت!! ئەوجا ئەو ژنە خەسارەتمەندە گەمژەیە رازی بوو،چونکە گرنگترین شت لای ئەو بەختەوەری بوو، خۆی دایە دەستی بۆ ئەو کارەش جارێك بەس بوو پێی فێر بێت و بۆ ئەوەی فائزە زگی پر بێت.

کاتێك فایزە زگی بوو هەواڵەکەی بە فاڵچیەکە داو هەندەی دی کارەکەی ئاڵۆزتر بوو، بەلاّم فاڵچیەکە بەپیلانی چەپەڵی خۆی بیری کردەوە و بەپێکەنینەوە بەم ژنە گەمژە نەفامەی گوت : تۆ دەتەوێ گەنجینەی بەختەوەریەکە بەدەست بهێنی یانیش کۆرپەڵەکە یەکێکیان هەلبژێرە سەرپشك بە ؟؟فایزە یەکسەر گوتی: بەلکو گەنجینەی بەختەوەری و نەك هیچی دی

پرسی؟بەلاّم چۆن کۆرپەلەکە لەبار ببەم.

فاڵچیەکە گوتی:من...یارمەتیت دەدەم.گوتی: تۆ!!... چۆن؟!

فاڵچیەکە گوتی: بەیارمەتی خێوە برادەرەکانم لە ژێر زەوی!

ئەوجا ئەم خوێن رێژە بەر بووە گیانی ودەستی لە هەناوی نا بۆ لەبار بردنی کۆرپەلەکە ، ئەم ژنە داماوە گەمژەیەش هەر نالە و هاواری بوو لە ئەنجامی ژان و ئازار، بەلاّم زۆری نەبرد دوا

هەناسەی لێ برا گیانیدا، فالچیەکە کە زانی داماوەکە مرد ، ویستی خۆی دەرباز بکات و دەرپەڕی و بەرەو سەر بانی مالآن بۆ ئەوەی کەس پێی نەزانێ بەسەر پایەی قادرمەیەکی داری کۆنی رزی هەڵ گەڕا وسەرکەوت ، زۆری نەمابوو سەرکەوێ لاچکی جلەکانی لە بزمارێکی قاندرمەکە گیر بوو و قاچی تێك ئالآ وسەراو سەر کەوتە سەر زەویەك کەف لە دەمی هات، خوێن لە دەمی بەربوو گەیشتە سزای کردەوە چەپەڵەکەی روحی دەرچوو.

بەڵێ ئەمەیە سەرەنجامی تەماعکاری و دنیا پەرستی و نەفامی بەرانبەر بە ئایین، کە دەبنە هۆکاری تێچون و فەوتان ، هەروەکو خوای گەورە و پێغەمبەرەکەی ئاگاداریان کردونەتەوە کە بەدوایی پیلانی شەیتان نەکەوین و کە هەڵمان بخەڵەتێنێت، چونکە شەیتان دوژمنێکی سەر سەختە بۆمان، هەروەکو خوای گەورە فەرموویەتی:شەیتان دوژمنێکی سەرسەختی ئێوەیە و بەدوژمنی خۆتانی بزانن، بەڵێ ئەمەیە سزای هەر کەسێك کە بەدوای شەیتان بکەوێ و یان هاوبەشی بکات هەروەکو سەرئەنجامی ئەم جۆرە تاوانە ڤێزەونە لە دنیا کە ریسوا بوون وشەرمەزارییە ،هەر خواش دەزانێ لە دوارۆژ چارەنوسیان چیان بەسەر دێ،هەروەکو ئەم جۆرە ژنە گەمژە نەفامە بەهۆی تەماعکاری و لاوازی باوەڕ

تیاچوو بە قیزەون ترین مردن سەری نایەوە، فالچیەکەش گەیشتە چارەنوسی نالە باری کردەوەکەی هەروەها کەس و کاری ژنە کەش کە یارمەتیان دا لە پێناوی تەماعگیری کچەکەیان بەرەو ڕێگای گومڕایی و تێ چوونیان برد و سەر شۆڕی هەردوو جیهانیان کرد و سزای خواش لە جۆری کردەوەیە.

هەروەکو خوایی گەورە دەفەرموێت:

﴿أَفَرَءَيْتَ مَنِ اتَّخَذَ إِلَٰهَهُۥ هَوَىٰهُ وَأَضَلَّهُ اللَّهُ عَلَىٰ عِلْمٍ وَخَتَمَ عَلَىٰ سَمْعِهِۦ وَقَلْبِهِۦ وَجَعَلَ عَلَىٰ بَصَرِهِۦ غِشَٰوَةً فَمَن يَهْدِيهِ مِنۢ بَعْدِ اللَّهِ ۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿٢٣﴾﴾

الجاثیة: ٢٣ واتە:هەوالم بدێ ئایا ئەو کەسەی ئارەزووی خۆی کردۆتە خوایی خۆی بەهۆی ئەوە ،خواش گومڕای کردووە کە زانیویەتی شایەنی ئەوەیە،لە ئەنجامی بەد هەلوێستی خۆی داو مۆری داوە بە ئەندامی بیستن و دڵ و دەرونی و پەردەی هێناوە بە سەر چاو و بینی دا و جا ئیدی کێیە بێجگە لە خوا هیدایەتی بدات، ئایا بیر ناکەنەوە و ئامۆژگاری وەرناگرن!!؟.........

# دڵداری مۆبایل

کچۆڵەیەك لە سەرەتای تەمەنی هەرزەکاری بەسەرهاتی خۆی بەو پەری داخ و کەسەر و پەشیمانی و فرمێسکەوە دەگەڕێتەوە دەڵێ:
لە سەرەتادا پەیوەندیەکەم بە ژمارە یەکی نەناسراوی مۆبایلێك کە بۆم هات وهەلم گرت، یەکسەرپەیوەنیەکی حەرام دەستی پێ کرد، تا بووە پەیوەندیەکی ئەویندارى و دلداریی ، وا مزانی کەوا کورەکە دێتە داخوازییم ومنی زۆرخۆشدەوێت ، داوای لێم کرد کە گەلیدا دەربچم تا بمبینێ لەسەرەتادا ڕەتم کردەوە ئەوجا هەڕەشەی پچڕانی پەیوەندی لەگەڵ کردم ، ترسام و بەرامبەری لاواز بووم ، وێنەی خۆم و پەیامێکی دۆستانەی بۆنداری بەگولاوم بۆی نارد ، داوای لێم کرد کە لەگەڵی دەربچم بۆ پیاسەو گەران ، بەلام دوبارە رەتم کردەوە دەربچم لەگەڵی دا،هەڕەشەی لێ کردم بەبلاوکردنەوەی وێنەکانم و چونکە ئەو دەنگانەی منی لەتەلەفۆن تۆماری کردبوو،ناچار لەگەڵی دەرچوم بەو مەرجەی بەزوترین کات بگەڕێمەوە، گەرامەوە بەلام چۆن گەڕانەوەیەك ؟ بەشەرمەزاری و خەسارەتمەندی،
پێم گوت: وەرە بمخوازە ، زۆر بەتوڕەیی و گاڵتە جارییەوە گوتی: من کچی بێناموسم ناوێت........

بەڵێ ئەمەیە ئەنجامی کارەسات و ئەزمونێکی سەختی من ، بۆیە ئەم کچە ڕوو لە هەموو کچان دەکات و دەڵێ: خوشکان نەکەن بکەونە داوی ئەم جۆرە پەیوەندیانە، لەو کەسە خراپانە دورکەونەوە کە بەرەو پەیوەندی ناشەرعیت دەبات و هەڵت دەخەڵەتێنێت، سەر شۆرت دەکەن و ئابڕوت دەبەن،بەم خۆشە و یستیانە باوەر مەکەن هەمووی داوی شەیتانە حەرامە و دەرەنجامەکەی هەروا دەبێت و خراپتریش، بەو جۆرە گەنجانە باوەر مەکەن و خۆتان بپارێزن ئەمانە گەمە و گاڵتە بە ناموسی خەڵك دەکەن، درۆزن و خیانەت کارن و کەمیان ڕاست دەردەچن ، چونکە مەبەستی هەمووان هەر شتێکەو ئاشکرایە و مرۆڤی ژیرو عاقڵ نابێ بکەوێتە داوی چەپەڵی ئەم جۆرە گەنجانە.

ژیرئەوکەسە یەکەپەند لە خەڵکی وەربگرێ،

نەك خۆی بکات بەپەند لە داخان بمرێ.

## تێبینیی پرسیار

ڕەنگە لێرەدا تێبینی بکرێت کەوا ئەم پەیوەندییە سۆزدارییە لەوانەیە ببێتە مایەی بەختەوەر بوون ، بەڵام بووە نەگبەتی بۆ خاوەنەکەی ،لەبەر ئەوە وامان لێ دەکات کەوا ئەم پرسیارە خێرایە بکەین،کە ئایا خۆشەویستی بەدبەختی بەدواوەیە یانیش بەختەوەری؟

وەڵامەکەی:خۆشەویستی دەبێتە مایەی سوتان و ئازار ئەگەر ژوانی ئەویندارەکەی زەحمەت بوو ،یانیش لەو کاتەی بێ باك و دڵرەقی لە ئەویندارەکە بەدی بکرێ،بەڵام ئەوین دەبێتە مایەی ئاسودەی و بەختەوەری و سۆزوحەسانەوە و دڵنەوایی لەو کاتەی کەوا لەگەڵ خۆشەویستەکەت دەژی، هەرچی دەتەوێ لە سۆز و خۆشەویستی و بەزەیی لێ دەبینی ئەویش تەنها لەو هاوسەر گیریە دێتە دی کەوا خوایی گەورە حەلالی کردوە لە سوکنایی هاوسەرداری کە خۆا بە میهرەبانی خۆی چاودێری دەکات ترس وقەدەغەشی تێدانیە.

چارەسەری ئەوین و خۆشەویستی:

ئەوین سۆزێکی سروشتییە کەوا بەسەر هەندێك کەس دا زاڵ دەبێ ودەستبەسەری دەکات،خەیاڵی دادەپۆشی گۆڕانکاری لە ڕەفتارەکانی دروست دەکات، هەروەها ئەگەر ئەوینەکە لە کاتی خۆی

نەبوونێنوێتی تێر نەکات،رەنگە ئەم جۆرە ئەوینە ببێتە چەندان دەردو نەخۆشی کەوا پێویستی بە چارەسەری خێرا و دروست هە

## ئەرکەکانی ژن لە ڕواندنی بەختەوەری خێزان

ژن و مێرد هەردووکیان ڕۆڵیان هەیە لە ڕواندنی تۆی بەختەوەری لەناو خێزاندا ئەمەش زۆر لێکۆڵینەوە و توێژینەوە سەلماندویانە کەوا هەردوکیان ڕۆڵی کاریگەریان هەیە بۆ دروست کردنی ماڵێکی پڕ ئاسودە و بەختەوەری ، هەروەکو(د.جۆن چرای)ئاماژەی پێ کردووە بۆ هەندێك لە هەڵوێستەکانی ئافرەت کە دەتوانی زیاتر ببێتە هۆکاری بەختەوەری و لێك نزیك بونەوەی ژن و مێرد وەکو پیادەکردنی ئەمانەی خوارەوە:

١. ئەگەر مێرد هەڵەیەکی کرد ژنەکە ئامۆژگاری نەکردو نەیگوت پێم نەگوتی وامەکە؟
٢. ئەگەر بۆ شتێك ڕەشبینیش بوو کە بۆی بکات ، بەلآم با سەرکۆنەی مێردە کەی نەکات.
٣. ئەو شتانەی کە داوای کردبوو کە مێردەکە بۆی نەکردبوو بەلآم ئەو لە بیرە خۆی دەباتەوە پێ دەڵێ قەیدی ناکا با بۆ سبەی بێ.

٤. ئەگەر ژنەکە دڵی مێردەکەی شکاند بە بێ مەبەست بوو ، لە مێردەکەی داوای لێ بوردن دەکات و بە خۆشەویستی قەرەبووی دەکاتەوە وە لە جیاتی زیاتر لێی نزیك دەبێتەوە.

٥. ئەگەر ژنەکە داوایی یارمەتی کردو پیاوەکە ڕەتی کردەوە لەبەر کەسایەتی خۆی و ژنەکە لێی نەگری و هەرچی گەورە و بچوکە بەگۆڕێ وەرناکات.

٦. ئەگەر کابرا داوای لێ بوردنی کرد لەسەر هەڵەیەك،ژنەکە چاوپۆشی لێ دەکات بە خۆشەویستی و سینگ فراونیەوە.

٧. گەرپتاوەکەداوای شتێکی لە ژنەکەی کرد ئەو بە دڵخۆشی و سینگ فراوانییەوە ڕازی دەبێت جێبەجێی بکات.

٨. پاش دڵشکانێك کە پێکدێنەوە،ژنەکە هەندێك خزمەتی سوکی دەکات بەڕێزەوە و لە دڵی ئەو گرفتەی پێشتر هەڵناگرێ وەکو ئەوەی هیچ نەقەومابێ وایە.

٩. کە پیاو هاتەوە ماڵێ ژنەکە بە دڵخۆشی و شادومانی پێشوازی لێ دەکات ،بەکەم و کورتیورووگرژی خۆی نیشان نەدات بە گرفتە کانی خێزانی پێشوازی ودەست پێ نەکات.

١٠. له پێداویستیەكانی ناو ماڵ كه مێردەكه نەیكردبوو بە پیاسەیەك ئەگەر  ژنەكە لە مێردەكەی بێ ئومێد ببوو داوای لێدەكات ، بەلاَم بە شارەزای و بەنەرم و نیانی و ڕێك و پێك بیری دەخاتەوە.

١١. نارەزا یی خۆی بە هێمنی دەردەبڕێ بەبێ پرتەو بۆڵە وسەر كۆنەكردن و ڕەت كردنەوە وبێ نا ئومێد بوون لە مێردەكەی.

## ئەركەكانی پیاو لەڕواندنی بەختەوەری خێزانیدا

بێگومان بەختەوەری بە تەنها بەكەسێك دروست نابێت، هەروەكو گوتراوە(چەپڵە بەیەك دەست لێ نادرێت)بۆیە پێویستە ژن و مێرد پێكەوە بە هاوبەشی هەوڵی بەدیهێنانی  بەختەوەری بدەن، لەم سۆنگەوە هەندێ ئامۆژگاری هەن بۆ پیاو داوای لێ دەكات لە گەڵ هاوژینەكەی خۆی بنەماكانی بەختەوەری بپارێزێ گەشەی پێ بدا هەروەكو(د.جۆن)كۆمەڵێك ڕێنمایی بۆ پیاوان داناوە وەكوئەمانەی خوارەوە:

١. كە گەڕایەوە ماڵەوە بە زەردە خەنە و سەلام دەست پێ بكە و پێش هەموو شتێك بە دوایی هاوسەرەكەتدا بگەڕێ و لە باوەشی بگرە (ئەگەر ماڵەكە چۆڵ بوو).

٢. به ووردی دەربارەی کارو باری ڕۆژانەی لێ بپرسە وەکو (چۆنی و چیتە و شتی نوێ چ هە یە؟).
٣. خۆت ڕابێنە لەسەر کاتی بێ دەنگی و پرسیار کردن بە ڕێك و پێکی.
٤. ئاگاداری کێشەکانی بەو هەوڵی چارەسەریان بدە و لەگەڵی بە سۆز و پەرۆش بە و بزانە بەشێك لەبەختەوەری و شادومانی لە دەستی ژنەکەتدایە.
٥. لەکاتی لە ماڵ دەرچوونت ماچی بکە و خوا حەفیزیْ لێ بکە(ماچ کردن لە تەنیایی دا دەکرێ)
٦. چوار جار لە باوەشی بگرە ڕۆژانە و دەست لە ملانەی بکە.
٧. بەلای کەمی ڕۆژانە دوو جار پێ بڵێ (خۆشم دەوێیت).
٨. لەکاتی خواردن دروست کردن دەستخۆشی و ستایشی بکە.
٩. سوپاسی بکە لەسەرئەو کارانەی کە بۆت ئەنجام دەدات.
١٠. جار جارە سەر سورمانی خۆت بۆ دیمەن و جل و بەرگی دەرببڕە.
١١. شتەکان لە جێگەی تەواوی خۆی دابنێ فرێیان مەدە و چاوەڕێی ئەو مەکە ئەو بۆت بکات، سەرکۆنەی مەکە و بە هێمنی بە بیری بێنەوە.

١٢. ئەگەر كارێكی گرانی ناو ماڵی هەبوو تۆش یارمەتی بدە وەكو:بەڕێ كردنی منداڵ بەرە و قوتابخانە،یان ڕێكخستنی ژوور و ئیشی قورس ونوێن هەڵگرتن ،یاخود خواردن ئامادە كردن.

١٣. پێكەوە پیاسەیەكی دەرەوە بكەن بەبێ منداڵ.

١٤. لەسەر ئیشەكەت پەیوەندی پێوە بكە و بەلای كەمی پێ ی بڵێ كە خۆشت دەوێ.

١٥. لەپێش سەرجێی ماوەی بیست خولەك دەرفەتی پێ بدە پەلەی لێ مەكە و سەرقاڵی مەكە لە و ماوەیەدا وەكو ئەوەی تۆ شتێك بخوێنیتەوە.

١٦. كاتێ قسەی لەگەڵدا كردی ڕۆژنامە یان شتێكت دەخوێندەوە لەدەستت دایبنێ و یان تەلەفزۆنەكە كز بكە بەتەواوی گوێی لێ بگرە ئاگات لێی بێت.

١٧. پێش لەماڵ دەربچی لێی بپرسە كە چی پێویستە و لەبیری مەكە بۆی بهێنە.

١٨. لەكاتێ قسەی بۆ دەكەی جار جارە دەستێكی لێ بدە.

١٩. ئەگەر درەنگ هاتیەوە هەواڵی بدێ و پەیوەندی پێوە بكە.

٢٠. ئەگەر سەفەری دوورت هەبوو کە گەیشتی هەواڵی بدێ کە بەسەلامەتی گەیشتی و ژمارەی مۆبایلی خۆتی بدێ ئەگەر لە دەرەوەی وڵات بووی.

٢١. ئەگەر سەفەری دوورت کرد پێ بڵێ چەندت پێ دەچێ.

٢٢. پێش چوونە سەیران یان سەفەرێك چەند ڕۆژێك پێی بڵێ کە دەردەچین نەك ئەو ڕۆژەی کە دەردەچی بە پەلە هەواڵی بدەیێ و شتی زۆری داوا لێ بکەی.

٢٣. بەهێمنی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکە لەکاتی دەرچونتان پەلەی لێ مەکە تا خۆی دەگۆڕێت و ئامادە دەبێت.

٢٤. لەکاتی نەخۆشی و ناڕەحەتی لەگەڵی بەسۆز ونەرم و خەمخۆربە.

٢٥. ئەوەی کە دەتەوێ بۆی بنوسە ئەگەر لەماڵ نەبوو لە ناندین دایبنێ تا بیخوێنێتەوە، ئەگەر ژنەکەت پیشەیەکی فەرمانبەری هەبوو لەو کاتەی لەماڵی هەندێك،لە ئیش و کارەکانی ناو ماڵی بۆ بکە و ئەرکی لەسەر سوك بکە تادێتەوە.

٢٦. ناوە ناوە بە دیاریەك بەسەری بکەوە وەکو گولێك یان شتێکی جوانی ناو ماڵ یان...یاخود دیاریەك لەو شتانەی کە ئەو حەزی لێیە.

٢٧. هەندێك یادەوەری هەن بەبیریان بێنەوە وەكو ڕۆژی هاوسەرگیریتان یان ڕۆژی لە دایك بوون و لە سەر مۆبایلەكەت تۆماری بكە نەوەك لە بیریان بكەی.

٢٨. ئەگەر نەساغ بوو لێ ی بپرسە و كاتەكانی دەرمان خواردنی وە بیربێنەوە.

٢٩. ئەگەر ویستت دەربچی یان بخەوی ئاگاداری بكەوە لە پێشتر.

٣٠. پێكەوە هەردووكتان بڕۆنە سەرپێخەفی نوستن لە یەك كاتدا پێكەوە بنون.

٣١. ئەگەر داوایی یارمەتی لێ كردی سەركۆنەی مەكە و بەهەڵەی دامەنێ و تا دەكرێ یارمەتی بدە.

٣٢. ئەگەر دڵت شكاند لەجیاتی هەندێك پەرۆشی و سۆزی بەرانبەر دەرببڕە پێی بڵێ (بمبورە)پاشان لێ گەڕێ تێت دەگات و بۆی شی مەكەوە زۆریش لەسەری مەڕۆ.

٣٣. كە سارد و هێمن بۆوە بەرێزەوە قسەی لەگەڵدا بكە و بە بێ گلەی و هەروەها لە سەر دڵەراوكێی بەردەوام بەجێی مەهێڵە.

تەواوبووسوپاس بۆ خوا.

## سەرچاوەکان:


١- ڕووداوەکانی دەوروبەر.

٢- کما تدین وتدان.

٣– قصص الهدایه.

٤– السعاده الزوجیه.


نوسراو و وەرگێڕدراوەکانی نوسەر کە چاپ کراون ئەمانەن:

١- بەسەر هاتی تۆبەکاران

٢- چاکسازی دڵان

٣- پەروەردەی منداڵان وئاسودەیی خێزان

٤- کەلەشاخ (حیجامە)

٥- خۆشەویستی وهاوسەرگیری وسێکس.

توێشوی بانگخوازان کە چل ﴿٤٠﴾ دانە نامیلکەیە؛ چاپکراوەکان

١-پەیامێك بۆ كچانی زانكۆ..... ٢- تا ببیتە بەختەوەرترین كەس.

٣- دادگای دادپەروەری............ ٤-چۆن دەبیتە موسڵمان٤

٥- چۆن ورە بەرز دەكەی؟.......٦-خۆشەویستی پێغەمبەرﷺ

٧- نەخۆشیەكانی دڵان............ ٨- شەمەندەفەری ڕۆژگار

٩-ئیسلام بەبێ ئاینزا............ ١٠- ژیر وبێ ئاگا.

چاپنەكراوەكان:

١١- لە نهێنیەكانی قورئان.......... ١٢- ترس وتكا.

١٣- لێبوردەیی......................... ١٤- سەلیقە.

١٥-بەروبومەكانی گوێڕایەڵی.......١٦- بەروبوومەكانی زیكر.

١٧- سوپاسگوزاری ونزا............ ١٨- پەیێی بەختەوەری.

١٩- دڵپاكەكان...................... ٢٠- چارەسەری ڕك وحەسودی.

٢١- نزاو نوێژ....................... ٢٢- زیكری ڕاستەقینە.

٢٣- گوێڕایەڵی وسەرپێچی خودا.. ٢٤- پەندی مردن.

٢٥- ژیانی دڵان.................. ٢٦- مردنی دڵان.

٢٧- حیكمەتی تاقیكردنەوەی خودا.. ٢٨- هاوسەرگیری سەركەوتوو.

٢٩- ڕوو وەرگێڕانی خودا لەبەندەی. ٣٠- نەنگی ونهێنیەكان.

چاپکراوەکان:

٣١- بەربەستەکانی وەرگێرانی خوا پەرستی.

٣٢- پیاوان تەنیا چوار جۆرن.

٣٣- براوە ودۆڕاو.

٣٤- سوپاسگوزاری نیعمەتەکان.

٣٥- کات.

٣٦- لەهەرە پێشەوەی شارەزا بوون بەرپرسیاری یە.

٣٧- زمانی خۆت بگرە.

٣٨- تورە مەبە.

٣٩- هیوا درێژی.

٤٠- ئایا پیشەکەی خۆت لەبیر چووە؟

٤١ـ سۆزێك بۆ خۆشەویست (درودی خوای لەسەر بیت) هۆنراوە

٤٢ـ بەختەوەری ژن ومێ دان

# پێرست


١- پێناسەی کتێب.............................................٢

٢- دەستپێك............................................... ٤

٣- ئاهی دایك.............................................٦

٤- دایە.................................................١١

٥- بێوە ژن..............................................١٣

٦- ڕۆژان ڕۆژی لەدووایە.................................١٧

٧- عیشق................................................٢١

٨- سزای ڕەزیلی.........................................٢٣

٩- چ بچێنی ئەوە دەدوریەوە............................ ٢٥

١٠- هاواری ویژدان......................................٢٨

١١- بەرهەمی خێر........................................٣١

١٢- چارەنووسی چاوچنۆکی........................................................ ٣٤

١٣- پیلانەکانی شەیتان............................................................ ٣٧

١٤- مارەبەجاش.................................................................. ٤١

١٥- پشت بەخوابەستان............................................................ ٤٨

١٦- ئیستیغفار.................................................................. ٥٤

١٧- بەخشین.................................................................... ٥٧

١٨- تەکسی..................................................................... ٦٠

١٩- ئامۆژگاری.................................................................. ٦٣

٢٠- خواناسی بەختەوەریە.......................................................... ٦٤

٢١- دادپەروەری عومەرﷺ.......................................................... ٦٦

٢٢- گەنجێکی دەستپاك............................................................ ٧٠

٢٣- دووژن...................................................................... ٧٣

٢٤- صەدەقە و نەخۆش............................................................ ٧٥

٢٥- گەنجێکی لەخواترس........................................................... ٧٩

٢٦- قەرەبووی خودا.............................................................. ٨٣

٢٧- کەخۆشەویستی دەگوڕێ........................................................ ٨٦

٢٨- داپۆشینی نهێنی خەڵك.......................................................... ٩١

٢٩- لەدەرگای خەڵك بدەی لەدەرگات دەدەنەوە.......................................٩٩

٣٠- ملوانکەی زێڕ.......................................................١٠٠

٣١- کچی فازیێك.......................................................١٠٣

٣٢- کچێکی زانا.......................................................١٠٨

٣٣- برایان بەڵا!!.......................................................١١٢

٣٤- ناپاکی.......................................................١٢٦

٣٥- جگەر گۆشە.......................................................١٢٨

٣٦- کاریگەری دوعا.......................................................١٣٠

٣٧- پێشەنگی.......................................................١٣٧

٣٨- ئەوین و پێکەوەژیان.......................................................١٤١

٣٩- زەماوەندێکی سادە.......................................................١٤٢

٤٠- هەرکەسێك بەنیازی خۆی.......................................................١٤٣

٤١- ئارام گرتن و متمانە بەخۆبون.......................................................١٤٤

٤٢- ئەستێرەیەکی بەناوبانگ(ئیلیزابیت تایلور).......................................................١٤٥

٤٣- تێکەڵاوی زیادەڕەوی.......................................................١٤٨

٤٤- بۆنی ناخۆشی دەم.......................................................١٥٠

٤٥- هەڵس وکەوتی ژنێکی هەوێدار.......................................................١٥١

٤٦- بەهەڵە تێگەیشتن لەسەرپەرشتیاری.......................................١٥٢

٤٧- هەڵبژاردنی بەهەڵە.......................................................١٥٤

٤٨- هەڵەی پێش زەماوەند.....................................................١٥٥

٤٩- کەس‌وکاری میر بەرامبەر ژن.............................................١٥٦

٥٠- سەرقاڵی پیاو بەبێ ئاگاداری ژن.........................................١٥٧

٥١- مێردێك حەز لەسەیران ناکات............................................١٥٧

٥٢- هەڵەی مێردێك..............................................................١٥٩

٥٣- ململانێ لەسەر خۆشەویستی..............................................١٦١

٥٤- ژنێك تەماعی لە پیاوەکەی زیاتربوو....................................١٦٢

٥٥- بەهەڵە تێگەیشت.............................................................١٦٤

٥٦- هاوسەرگیریەکی ناهاوشان.................................................١٦٥

٥٧- مانای هاوسەریەتی نازانێ.................................................١٦٧

٥٨- بەهەڵە هەڵبژاردنی هاوسەر...............................................١٦٩

٥٩- بێ وەفای و ستەم...........................................................١٧٠

٦٠- نەزانی و پەلەکردن.........................................................١٧٣

٦١- ستەم و لاوان و تاوان......................................................١٧٥

٦٢- بۆخۆشەویستی مێردکەی لای شێر........................................١٧٧

٦٣- لەنهێنییەكانی بە ختەوەری.................................................١٨٠

٦٤- فاڵچی......................................................................١٨٤

٦٥- دڵداری مۆبایل...........................................................١٨٩

٦٦- تێبینی پرسیار............................................................١٩١

٦٧- ئەركەكانی ژن لەڕواندنی بەختەوەری لە خێزاندا.......................١٩٢

٦٨- ئەركەكانی پیاو لەڕواندنی بەختەوەری لەخێزاندا........................١٩٤

٦٩- سەرچاوەكان...............................................................١٩٩

٧٠- نوسروو وەرگێردراوە كانی نوسەر.......................................١٩٩